# قەڵای

# منداڵی مسوڵمان

پایەکانی ئایینی ئیسلام - بانگ - دەستنوێژ - فێربوونی
نوێژ هەنگاو بە هەنگاو - سوننەتەکانی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ
- مانا و تەفسیری ناوە پیرۆزەکانی خودای گەورە.



ئامادەکردنی: هیوا عەبدوڕڕەحمان

## ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد

**ناونیشانی:** سلێمانی/ شەقامی ئیبراهیم پاشا / فولکەی گۆزەکان / نزیک ناوەندی پۆلیسی ڕۆژهەڵاتی کوێان

**پەیوەندی:** 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/





ناونیشان: قەڵای منداڵی مسوڵمان.

ئامادەکردنی: هیوا عبدالرحمن.

بابەت: پەروەردەی ئیسلامی.

پەخشانگە: ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

ساڵی چاپ: ٢٠١٩ میلادی چاپی چوارەم.


تێبینی: لە کاتی نووسینەوەی تێکستە عەرەبییەکان بە وشەی کوردی لە بری (ّ) شەددەی عەرەبی پیتە کوردییەکەمان کردووە بە دوو پیت بۆ ئەوەی بە دروستی بخوێنرێتەوە، بۆ نموونە:

﴿بِسمِ اللهِ﴾ (بیسمی للاهـ).

هەروەها کەسرەی پیتی عەرەبی (ـِ) لە کوردییەکەدا کردوومانە بە (ی)، فەتحە (ـَ) کراوە بە (ە) بزوێنی کورت، ضمە (ـُ) کراوە بە (واو) لەبەر ئەوەی لە کوردیدا جێگرەوەی ئەمانەمان نییە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا﴾

**پێشەکی:**

سەرەتا بە ناوی خودای گەورە و میهرەبان و سوپاس بۆ خودای گەورە کە یارمەتیداین لە تەواوکردنی ئەم نامیلکەیەدا، کە لە سێ بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەمیان تایبەتە بە فێرکردنی دەستنوێژ و نوێژ بە وێنەوە، بەشی دووەم هەندێک لە سوننەتەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمانی ﷺ لەخۆگرتووە، کە هەوڵدراوە کۆکراوەیەک بێت لەو سوننەتانەی کە رۆژانە دووبارە دەبنەوە و لە ژیانی رۆژانەماندا زۆر بەکاریان دەهێنین، بەشی سێیەمیش بریتییە لە نەوەد و نۆ ناو لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە و میهرەبان و ماناکانیشیان.

لێرەدا جێی خۆیەتی کە سوپاسی مامۆستای بەرێز ﴿د.عوسمان محەمەد غەریب﴾ بکەم کە ئەرکیان کێشا و پێیداچووەوە و بە تێبینییەکانی کارەکەی دەوڵەمەند کرد، هەروەها سوپاسی مامۆستای بەرێز ﴿د.محەمەد عەبدوڵلا﴾ش دەکەم کە ئەویش پێداچوونەوەیەکی بۆ ئەنجام دا، ﴿مامۆستا مەلامەحمود گەلالی﴾ کە پێداچوونەوەی کرد.

بە ئومێدی ئەوەی ئەم هەڵسوکەوتانە رەنگدانەوەی هەبێت لە ژیانی مندالانی خۆشەویستدا و ببێتە هۆی ئەوەی کە لە ژیانیاندا پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بکەنە پێشەنگ و پێشەوای خۆیان و سەرجەم هەڵوێستە ناوازەکانی ئەو سەروەرە لە ژیانیاندا رەنگبداتەوە، تاکو ئەوانیش کە ئومێدی داهاتوومانن؛ ببنە جێی متمانە و ئاواتی دایکان و باوکانیان، هەروەها لە دوارۆژیشدا ببنە کەسێکی خزمەتگوزار و دڵسۆز و داهاتوویەکی گەش و رۆشن بن بۆ نەتەوەکەمان.

لەکۆتاییدا داواکارم لە خوای گەورە یارمەتیمان بدات و پشت و پەنامان بێت و بەردەوامیمان پێ ببەخشێت.

# بەشی یەکەم

## ئایینی ئیسلام:

کاتێک خوای گەورە زەوی دروستکرد و مرۆڤیشی هێنایە سەر زەوی، هەر لەو کاتەوە ئایین بووە پێویستییەکی مرۆڤ و خوای گەورە بەهۆی پێغەمبەرەکانیەوە ئەم ئایینەی بۆ مرۆڤەکان ڕەوانەکرد؛ لەبەر ئەوەی بە تاک و تەنهایی خوای گەورە بپەرستن.

شەریعەت و ئایینی ئیسلامیش کۆتا ئایینی ئاسمانییە و وەکو دوایین بەرنامە خوای گەورە بە کۆتا پێغەمبەردا محەمەد ﷺ ناردی بۆ هەموو جیهانیان، کە خەڵکی بانگەکرد بۆ خێر و چاکە و بڕواهێنان و پەرستنی خوای گەورەی تاک و تەنها و بێهاوتا و بڕوابوون بە فریشتەکان و کتێبە ئاسمانییەکان و پێغەمبەران ﷺ و ڕۆژی دوایی وبڕوابوون بە قەزا و قەدەر.

هەروەها ئایینی ئیسلام خەڵکی بانگەکات بۆ سیفاتەکانی لێبووردەیی و سینەفراوانی و یارمەتیدان و هاوکاریکردنی کەسانی تر و جێبەجێکردنی هەموو ئاکار و ڕەوشتە جوانەکان.

**ئایینی ئیسلام پێنج پایەی هەیە، ئەوانیش بریتین لە:**

### ١. شایەتومان:

پایەی یەکەمە بۆ چوونە ناو ئایینی ئیسلام و بریتییە لە وتنی:

﴿أَشهَدُ أَن لا إلهَ إلاّ اللهُ وَأَشهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسولُ الله﴾.

(ئەشهەدو ئەللا ئیلاهە ئیللەڵڵاهـ، وەئەشهەدو ئەننە موحەممەدەن ڕەسولوڵڵاهـ).

**واتە:** شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێک نییە شایانی پەرستن بێت جگە لە﴿الله﴾ و موحەممەدیش نێردراو و پێغەمبەری خودایە.



### ٢. نوێژ:

بریتییە لە کۆڵەکەی ئایین و لە ڕۆژێکدا پێنج نوێژی فەڕز هەیە (بەیانی و نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارە و خەوتنان)، کە لە دواتردا باسی ڕکاعەتەکانی دەکەین. ﴿باشترە لە تەمەنی ٧ ساڵییەوە منداڵان فێری نوێژ بکرێن، تاکو کە گەورەبوون بزانن و فێربووبن نوێژ بکەن﴾.

### ٣. زەکاتی ماڵ و سامان:

ئەویش کاتێک دەبێت کە بڕێک پارەی دیاریکراو، یان ئەو شتانەی کە زەکاتی لێ دەکەوێت، کە بگاتە سنوورێکی دیاریکراو و کات و ماوەیەکی دیاریکراوی بەسەردا بڕوات؛ ئەوا دەبێت هەریەکەیان بە پێی پێوەری خۆی زەکاتی لێ بدرێت.

### ٤. ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان:

ئەویش بریتییە لە بەڕۆژووبوون، واتە خۆبەدوورگرتن لە هەموو جۆرە خواردن و خواردنەوەیەک، کە لە ساڵێکدا یەک مانگی دیاریکراوە و فەڕزە لە سەرمان بەڕۆژووبین.

### ٥. حەجی ماڵی خودا ﴿کەعبەی پیرۆز﴾:

ئەویش لەسەر کەسێک فەڕزە کە موسوڵمان و عاقڵ و ژیر و باڵغ بێت و بڕی پارەی پێویستی هەبێت بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە پیرۆزە، لە سەرەتای مانگی ﴿ذي الحجة﴾دا کاتی جێبەجێکردنیەتی.

# چۆنیەتی بانگدان

**بانگدان:** بریتییە لە بانگکردن بۆ هاتنی کاتی نوێژە فەرزەکان، کە لە ڕۆژێکدا پێنج جار بانگ دەدرێت.

**بۆ کاتی بانگدان ئەو کەسەی بانگ دەدات ڕوو بە قیبلە دەوەستێت و دەڵێت:**

اللهُ أَكبَرُ اللهُ أَكبَرُ اللهُ أَكبَرُ اللهُ أَكبَرُ

أَشهَدُ أَن لا إِلهَ إِلاَّ الله أَشهَدُ أَن لا إِله إِلاَّ الله

أَشهدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسولُ الله أَشهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسولُ الله

حَيَّ عَلى الصَّلاة حَيَّ عَلى الصَّلاة

حَيَّ عَلى الفَلاح حَيَّ عَلى الفَلاح

اللهُ أَكبَرُ اللهُ أَكبَرُ

لا إِلهَ إِلاَّ الله

**تێبینی:** بەڵام لە کاتی بانگی بەیانیدا دوای وتنی: ﴿حَيَّ عَلى الفَلاح﴾ دووجار دەڵێت: ﴿الصَّلاةُ خَيرٌ مِنَ النَّوم﴾ پاشان بانگەکە تەواو دەکات.



## چۆنیەتی وەڵامدانەوەی بانگ

**بانگبێژ چی وت وەکو ئەو دەیڵێیتەوە، تەنها ئەو کاتەی کە دەڵێت:**

﴿حَيَّ عَلى الصَّلاة حَيَّ عَلى الصَّلاة﴾

﴿حَيَّ على الفَلاح حَيَّ عَلى الفَلاح﴾

تۆ لەو کاتەدا دەڵێیت:

﴿لا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلاّ باالله﴾

## دوعای دوای بانگ

**هەر کاتێک بانگبێژ لە بانگەکەی تەواوبوو، سوننەتە ئەم دوعایە بخوێنین:**

﴿أللّهُمّ رَبَّ هذِهِ الدَّعوَةِ التَّامَّة وَالصَّلاةِ القائِمَة آتِ مُحَمَّداً الوَسِيلَةَ وَالفَضِيلَةَ وَابعَثهُ مَقاماً محموداً الّذي وَعَدتَه﴾.

ئەڵڵاهوممە ڕەببە هانیهی دەعوەتی تتاممەهـ، وەصصەلاتیلقائیمەهـ، ئاتی موحەممەدەنیلوەسیلەتە وەلفەضیلەهـ، وەبعەثهو مەقامەن مەحمودەنیللەذی وەعەدتەهـ.

# باسی دەستنوێژگرتن

**ئەو مەرجانەی کە دەبێت لە دەستنوێژدا هەبێت:**

١. **نییەتهێنان:**

کە پێویستە نییەتی هەبێت کە دەیەوێت دەستنوێژ بشۆرێت، هەروەها سوننەتە پێش دەستنوێژ شوشتن بڵێین:

﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ ﴿بیسمی للاهـ﴾ **واتە: بە ناوی خودا.**

٢. **شۆردنی ڕووخسار (دەم و چاو):**

لە سەرەتادا بە جوانی دەستەکانمان بە ئاو و سابوون دەشۆرین و پاشان ئاو لە دەم و لووتمان وەردەدەین و دواتر دەم و چاومان دەشۆرین ﴿لە بەشی سەرەوەی ناوچاوانەوە لەو شوێنەوە کە مووەکانی قژی تێدا ڕوواوە، تاکو کۆتایی چەناگە و تەواوبوونی ڕووخسار، هەروەها لە نێوان هەردوو گوێچکەکان لە نەرمایی بەردەم گوێیەکەوە بۆ نەرمایی گوێیەکەی تر﴾ ﴿**سوننەتە ٣ جار دووبارەی بکەینەوە**﴾.

٣. هەردوو دەست و قۆڵەکانمان تاکو پشتی ئانیشکمان دەشۆرین ﴿**٣ جار سوننەتە**﴾، سەرەتا قۆڵی لای ڕاستمان دەشۆرین، پاشان قۆڵی لای چەپمان.

٤. سەرمان ﴿بەشی پێشەوەی بەرەو دواوە﴾ تەڕی دەکەین و دەستی پێدادەهێنین. پاشان دەستی تەڕ دەهێنین بە گوێیەکانماندا و پاکی دەکەینەوە.

٥. هەردوو قاچەکانمان تاکو قولە پێیەکانمان دەشۆرین، سەرەتا قاچی ڕاستمان دەشۆرین پاشان قاچی چەپمان.

٦. ڕیزبەندیکردن لەو خاڵانەی پێشوودا، واتە دەبێت خاڵی یەکەم ئەنجام بدەین، پاشان دووەم و بەو شێوەیەو تا دوایی.

* خاڵێکی گرنگ هەیە کە نابێت لە کاتی دەستنوێژگرتندا ئاوی زۆر بەکاربهێنین، چونکە کارێکی باش نییە و زیادەڕۆییکردنە.

# ڕوونکردنەوەی شێوازی شۆردنی دەستنوێژ بە وێنە

سەرەتا پێویستە پێش دەستنوێژ بڵێین:

﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾.

﴿بیسمی للاهـ﴾.

واتە: بە ناوی خودا.






١. لە سەرەتادا دەبێت نییەتی ئەوەمان هەبێت کە دەمانەوێت دەستنوێژ بشۆرین، دەبێت دەستەکانمان بە جوانی بشۆرین.




٢. ئاو لە دەممان وەردەدەین.

﴿٣جار سوننەتە﴾




٣. ئاو لە لووتمان
وەردەدەین و پاکی
دەکەینەوە.
﴿٣جار سوننەتە﴾




٤. شۆردنی ڕووخسار ﴿دەم و چاو﴾:
لە بەشی سەرەوەی ناوچاوانەوە لەو
شوێنەوە کە مووەکانی قژی تێدا ڕوواوە،
تاکو کۆتایی چەناگە و تەواوبوونی
ڕووخسار، هەروەها لە نێوان هەردوو
گوێچکەکان لە نەرمایی بەردەم گوێیەکەوە
بۆ نەرمایی گوێیەکەی تر.
﴿سوننەتە٣جار دووبارەی بکەینەوە﴾.




٥. دەستی ڕاستمان تاکو
پشتی ئانیشکمان دەشۆرین
﴿٣جار سوننەتە﴾




٦. دەستی چەپمان تاکو
پشتی ئانیشکمان دەشۆرین.
﴿٣جار سوننەتە﴾




٧. سەرمان ﴿بەشی
پێشەوەی بەرەو دواوە﴾
دەستی تەڕی پێدادەهێنین.




٨. لە دوای ئەوەی دەستی
تەڕمان هێنا بە سەر سەرماندا
ڕاستەوخۆ گوێیەکانمان بە
دەستەکانمان پاک دەکەینەوە.




٩. قاچی ڕاستمان تاکو
قولە پێیەکانمان دەشۆرین
و نێوانی پەنجەکانی قاچ بە
جوانی دەشۆرین.
﴿٣جار سوننەتە﴾




١٠. قاچی چەپمان تاکو
قولە پێیەکانمان دەشۆرین
و نێوانی پەنجەکانی قاچ بە
جوانی دەشۆرین.
﴿٣جار سوننەتە﴾

# دوعای دوای دەستنوێژ شۆردن

سوننەتە لە دوای دەستنوێژگرتن بڵێین:

﴿أَشهَدُ أَن لا إلهَ إلاّ اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لهُ وَأَشهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسولُهُ، اللّهُمَّ اجعَلنى مِنَ التَّوّابين وَاجعَلنى مِنَ المُتَطَهِّرين سُبحانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ أَشهَدُ أَن لا إلهَ إلاّ أَنتَ أستَغفِرُكَ وَأَتوُبُ إلَيك﴾.

ئەشهەدو ئەللا ئیلاهە ئیللەڵڵاهو وە ئەشهەدو ئەننە موحەممەدەن عەبدوهو وە ڕەسولوهو، ئەڵڵاهوممەجعەلنی مینەتتەووابین وەجعەلنی مینەلموتەططەهیرین، سوبحانەکە ئەڵڵاهوممە وەبیحەمدیکە ئەشهەدو ئەللا ئیلاهەئیللا ئەنتە ئەستەغفیرۆکە وە ئەتوبوئیلەیک.

**واتــە:** شـــایەتی دەدەم کە هیچ پەرســتراوێک نییە جگە لــە ﴿اللّٰه﴾ تاک و تەنهــا و بێ هاوبەشــە و شــایەتی دەدەم کــە محەمەد بەنــدە و نێردراو و پەیامهێنــەری ئــەوە، خودایــە بمگێڕیــت لــەو کەســانەی بــەردەوام تەوبــەکارن و بمگێڕیت لەو کەســانەی بەردەوام خۆیــان پاک ڕادەگرن، پاکــی و بــێ عەیبــی و ناتەواوی و ســوپاس بــۆ تۆیە خودایە، شــایەتی دەدەم کــە هیــچ پەرســتراوێک نییــە جگە لە تــۆ، داوای لێخۆشــبوونت لێدەکــەم و دەگەڕێمــەوە بــۆ لای تۆ.

* **پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت:**

هەر کەســێک دەســتنوێژی تــەواو بشــۆرێت و ئەم ســوننەتە بڵێت هەر هەشــت دەرگاکــەی بەهەشــتی بــۆ دەکرێتەوە، لــە کامیانــەوە ئارەزوو بکات دەچێتــە ناوی.

# ئەو شتانەی کە دەستنوێژ دەشکێنن و دەستنوێژ بەتاڵ دەکەنەوە

١. دەرچوونی هەر شتێک لە پاش و پێشی مرۆڤ.
٢. نوســتنێکی قــووڵ کە بە تەواوەتی بێت و خــەوی لێبکەوێت، یان لەهۆشی خۆی بچێت.
٣. دەرچوونی خوێنێکی زۆر.
٤. باش نەشۆردنی ئەندامەکان.
٥. ڕیزبەنــدی نەکــردن و یەک لــە دوای یەک نەبوونــی ئەندامەکان ﴿واتە دەبێت یەکەمجار دەموچاو بشــۆردرێت، پاشــان دەســتەکان، ...هتد﴾.
٦. بەریەککەوتنی پێستی پیاو و ژنی نامەحرەم.

# حیکمەتەکانی دەستنوێژ

١. دەســتنوێژ دەبێتــە هۆی نزیکبوونــەوەی مرۆڤی موســوڵمان لە خوای گــەورەوە.
٢. دەســتنوێژ دەبێتــە هــۆی ئــەوەی کــە بــەردەوام پاکوخاوێن و گورجوگــۆڵ و چــالاک بین.
٣. دەســتنوێژ دەبێتــە هــۆی پاکبوونەوەمان لە هەڵەکانمــان، لەبەر ئــەوەی خوای گەورە کەســانی پــاک و خاوێنی خۆشــدەوێت.
٤. دەســتنوێژ وامــان لێدەکات کــە جیاوازبین لە کەســانی تر لەبەر ئــەوەی بــەردەوام خۆمان بە پاکو خاوێنــی ڕادەگرین.

# قامەتکردن بۆ نوێژی جەماعەت

**قامەتکردن:**

بریتییە لـە ئاگادارکردنـەوەی نوێژخوێنان بۆ دەسـتپێکردنی نوێژ، لـە کاتـی نوێژی بەکۆمەڵـدا قامـەت دەکرێت. ئەو کەسـەی قامەت دەکات دەڵێت:

اللهُ أَكبَرُ اللهُ أَكبَرُ

أَشهَدُ أَن لا إله إلاّ الله أَشهدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسولُ الله

حَيَّ عَلى الصَّلاة حَيَّ عَلى الفَلاح

قَد قامَتِ الصَّلاة قَد قامَتِ الصَّلاة

اللهُ أَكبَر اللهُ أَكبَر

لا إلهَ إلاّ الله

# فێربوونی نوێژ

## ئەو مەرجانەی کە پێویستە لە نوێژدا هەبێت:

١. کاتی نوێژەکە هاتبێت.

٢. ڕووکردنــە قیبلە: ﴿واتە ڕووکردنە کەعبەی پیـرۆز﴾، لەو کاتەدا کە نوێژەکە دەخوێنێت.

٣. خۆداپۆشـین: بـۆ پیـاوان پۆشـاکی پێویسـتی لەبـەردا بێـت و عەورەتی داپۆشـیبێت ﴿کـە نێوانی ناوکـی تاکو ئەژنـۆی دەگرێتەوە﴾، بـۆ ئافرەتانیـش هەموو جەسـتەی داپۆشـرابێت، جگە لـە دەم و چاو و دەسـتەکانی تاکـو مەچەکی، مەرجی پۆشـاکەکە ئەوەیە تەسـک و تەنک نەبێـت کە پێسـت و شـێوەی جەسـتەی دەربکەوێت.

٤. پاکوخاوێنی و پاکیەتی لەبێ دەسـتنوێژی: دەبێت جەسـتە و دڵ و پۆشـاک و ئەو شـوێن و جێگەیەش کە نوێژی تێـدا دەکرێت پاکوخاوێن بێت.



# بۆ باسکردنی پایەکانی نوێژ
# وا بە وێنە ڕوونیان دەکەینەوە

١. **نییەتهێنان:** بە دڵ نییەتهێنان بۆ ئەو نوێژەی دەمانەوێت ئەنجامی بدەین بۆ نموونە بڵێین: نییەتمە نوێژی ئەم نیوەڕۆیە ئەنجام دەدەم، پاشان دەبێت ڕوو بە قیبلە بووەستین و دەستەکانمان تاکو ئاستی گوێچکەکانمان بەرز دەکەینەوە و دەڵێین:

﴿اللهُ أَكبَر﴾. ﴿ئەڵڵاهو ئەکبەر﴾.



* هەروەها سوننەتە دوای وتنی ﴿ئەڵڵاهو ئەکبەر﴾ی دەستپێکردنی نوێژ ئەم دوعایە بخوێنین:

﴿اللهُ أكبَرُ كَبيراً، وَالحَمدُلله كَثيراً، وَسُبحانَ اللهِ بُكرَةً وَأَصيلاً﴾.

(ئەڵڵاهو ئەکبەڕ و کەبیرەن وەلحەمدولیللاهی کەثیرەن وەسەبحانەڵڵاهی بوکرەتەن وەئەصیلەن).

**واتە:** بە گەورەیی دەڵێم خودا گەورەترە لە هەموو شتێک و سوپاس و ستاییشێکی زۆر بۆ خودا و پاکی و بێگەردی بۆ خودا لە بەیانییان و ئێواراندا.

٢. وەستان بە پێوە و دەستی ڕاست دەخەینە سەر دەستی چەپمان و سەیری شوێنی سوجدەکەمان دەکەین وسوورەتی ﴿الفاتحة﴾ دەخوێنین، هەروەها لە دوای سوورەتی ﴿الفاتحة﴾ یەکێک لە سوورەتە کورتەکان، یان چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز دەخوێنین ﴿تەنها لە ڕکاعەتی یەکەم و دووەمدا لە دوای سوورەتی فاتیحە چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز دەخوێنرێت﴾.




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾
ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾
ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾
إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهْدِنَا
ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ
عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ
وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾

**﴿ئەعوذو بیللاهی مینەششەیطانی ڕڕەجیم﴾**

﴿بیسمی للاهی ڕڕەحمانی ڕڕەحیم(١) ئەلحەمدولیللاهی ڕەببیل عالەمین(٢) ئەڕڕەحمانی ڕڕەحیم(٣) مالیکی یەومی ددین(٤) ئییاکە نەعبودو وەئییاکە نەستەعین(٥) ئیهدینە صصیراطەلموستەقیم(٦) صیراطەللەذینە ئەنعەمتە عەلەیهیم غەیریل مەغضوبی غەلەیهیم وەلەضضاللیین(٧)﴾ **ئامین.**




٣. دوای خوێندنی سـوورەتی فاتیحە و ئەو چەند ئایەتـەی خوێندمان دەڵێین:

﴿اللَّهُ أَكْبَرُ﴾.

﴿ئەڵڵاهو ئەکبەر﴾.




٤. دواتـر دەچینە ڕکـووع و دەسـتەکانمان لەسـەر ئەژنۆکانمـان دادەنێیـن و دەڵێین:

﴿سُبحانَ رَبِّيَ العَظِيمِ وَبِحَمدِهِ﴾.

﴿سوبحانە ڕەببیەلعەظیم وەبیحەمدیهی﴾.

﴿٣ جار سوننەتە﴾.

**واتـە:** پاکـی و بـێ کـەم و کورتـی و گەورەیی بۆ پـەروەردگاری مەزنمە و سوپاسـگوزاری خودای گەورەم.



٥

٥. لەوکووع هەڵدەستینەوە تاکو پشتمان ڕێک دەبێتەوە و ڕێک دەوەستین و دەڵێین:

﴿سَمِعَ اللّٰهُ لِمَن حَمِدَهُ رَبَّنا وَلَكَ الحَمد﴾.

﴿سەمیعەڵڵاهو لیمەن حەمیدەهو ڕەببەنا وەلەکەلحەمد﴾.

**واتە:** خودا گوێبیستی ئەو کەسەیە کە سوپاسی دەکات و پەروەردگارمان! هەموو سوپاس و ستایشێک هەر بۆ تۆیە.

٦.﴿اللّٰهُ أكبَر﴾ ئەڵڵاهو ئەکبەڕ دەڵێین و دەچینە سوجدە، یەکەمجار ئەژنۆمان پاشان دەستمان و پاشان سەرمان دەخەینە سەر زەوی (کە ناوچەوانمان و لوتمان لەسەر زەوی بێت) و دەڵێین:

﴿سُبحانَ رَبِّيَ الأَعلى وَبِحَمدِهِ﴾.

(سوبحانە ڕەببیەلئەعلا وەبیحەمدیهی).

﴿٣ جار سوننەتە﴾.

**واتە:** پاکی و بێ کەم و کورتی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری مەزن و باڵایە و سوپاسگوزاری خودای گەورەم.

٦



* کاتێک لە سوجدەداین تەنها دەستەکانمان لەسەر زەوی دەبێت و باڵمان بە کراوەیی بێت نەک بینوسێنین بە جەستەمانەوە، یان تاکو ئەنیشکمان بخەینە سەر زەوی، واتە وەکو وێنەکە بێت.




٧. ﴿اللهُ أَكبَر﴾ ئەڵڵاهو ئەکبەڕ دەڵێین و سەرمان بەرزدەکەینەوە و بەو شێوەیە دادەنیشین کە دەستەکانمان لەسەر ڕانمان دادەنێین و سوننەتە لەو وەستانەدا بڵێین:

﴿رَبِّ إغفِرلى﴾.

﴿ڕەببیغفیرلی﴾.

﴿٢ جار سوننەتە﴾.

**واتە: خودایە لێم خۆشببە.**

٨. ﴿اللهُ أَكبَر﴾ ئەڵڵاهو ئەکبەڕ دەڵێین و پاشان بۆ جاری دووەم سوجدە دەبەین، هەمان شێوەی سوجدەی یەکەم دووبارە دەکەینەوە و دەڵێین:

﴿سُبحانَ رَبّیَ الأَعلی وَبِحَمدِهِ﴾.

﴿سوبحانە ڕەببیەلئەعلا وەبیحەمدیهی﴾.

﴿٢ جار سوننەتە﴾.





٩. ﴿اللَّهُ أَكْبَرُ﴾ ئەڵڵاهو ئەکبەر دەڵێین و لە سوجدە هەڵدەستینەوە و ئامادە دەبین بۆ ڕکاعەتی دووەم و لە ڕکاعەتی دووەمدا هەمان جووڵەکانی ڕکاعەتی یەکەم دووبارە دەکەینەوە.



١٠. دوای تەواوبوونی ڕکاعەتی دووەم لەو کاتەدا هەڵناستینەوە سەر پێ و دوای هەستانەوە لە سوجدەی دووەم تەحییات دەخوێنین و دەستەکانمان دەخەینە سەر ڕانمان و پەنجەکانی دەستی ڕاستمان بەیەکترەوە دەنووقێنین تەنها پەنجەی شایەتمان نەبێت کە بە کراوەیی دەیهێڵینەوە و دەستی چەپیشمان لەسەر ڕانمان بە کراوەیی و بە ڕێکی دایدەنێین.

# تەحییاتی کورت

التَّحيّاتُ للهِ، وَالصَّلَوتُ وَالطّيباتُ، السّلامُ
عَلَيكَ أَيُّها النَّبيُّ وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ، السَّلامُ عَلَينا
وَعَلى عِبادِ اللهِ الصّالِحِين، أَشهَدُ أَن لا إِلهَ إِلاّ الله،
وَأَشهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسولُهُ، اللّهُمَّ صَلِّ عَلى
مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِ مُحَمَّدٍ.

﴿ئەتتەحیاتـــو لیلاهـــی وە صصەلەواتـــو وە ططەیبات و ئەسســـەلامو عەلەیکـــە ئەیوهەننەبییو وە ڕەحمەتوڵڵاهی وە بەڕەکاتوهو ئەسســـەلامو عەلەینا وەعەلا عیبادی للاهی صصالیحین ئەشـــهەدو ئەللائیلاهە ئیللەڵڵاهـ، وە ئەشـــهەدو ئەننە موحەممـــەدەن عەبدوهو وە ڕەســـولوهو ئەڵڵاهوممە صەللی عـــەلا موحەممەدی وە عەلا ئالـــی موحەممەد﴾.



## تەحییاتی درێژ

التَّحيّاتُ للهِ، وَالصَّلَوتُ وَالطّيبات، السّلامُ عَلَيكَ
أَيُّها النَّبيُّ وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ، السَّلامُ عَلَينا وَعَلى
عِبادِاللهِ الصّالِحِين، أَشهَدُأَن لا إلهَ إلاّالله، وَأَشهَدُأَنَّ
مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسولُهُ، اللّهُمَّ صَلِّ عَلى مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِ
مُحَمَّدٍ كَما صَلّيتَ على إبراهيمَ وَعلى آلِ إبراهيم، إنَّكَ
حَميدُ مَجيدُ، اللّهُمَّ بارِك عَلى مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِ مُحَمَّدٍ كَما
بارَكتَ عَلى إبراهيمَ وَعَلى آلِ إبراهيمَ، إنَّكَ حَميدُ مَجيدُ.

﴿ئەتتەحیاتــو لیلاهی وە صەلەواتو وەططەیباتو ئەسســەلامو عەلەیکە ئەیوهەننەبییــو وە ڕەحمەتوڵڵاهی وە بەڕەکاتوهو ئەسســەلامو عەلەینا وەعــەلا عیبادی للاهــی صصالیحین، ئەشــهەدو ئەللائیلاهــە ئیللەڵڵاهـ. وە ئەشــهەدو ئەننە موحەممــەدەن عەبدوهو وە ڕەســولوهو، ئەڵڵاهومە صەللــی عەلا موحەممــەدی وە عەلا ئالــی موحەممەدی کەمــا صەللەیتە عــەلا ئیبڕاهیمە وە عەلا ئالــی ئیبڕاهیمە ئیننەکــە حەمیدوممەجید، وە باریــک عەلا موحەممــەدی وە عەلا ئالــی موحەممەدی کەمــا باڕەکتە عەلا ئیبڕاهیمــە وە عەلا ئالــی ئیبڕاهیمە ئیننەکــە حەمیدوممەجید﴾.

١١

١١. پاشان لە دوای تەواوبوونی تەحیات یەکەمجار بە لای ڕاستدا سەلام دەدەینەوە و دەڵێین:

﴿السَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ الله﴾.

﴿ئەسسەلامو عەلەیکوم وە ڕەحمەتوڵڵاهـ﴾.



١٢

١٢. دووەم جار بە لای چەپدا سەلام دەدەینەوە و دەڵێین:

﴿السَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ الله﴾.

﴿ئەسسەلامو عەلەیکوم وە ڕەحمەتوڵڵاهـ﴾.



* لەو نوێژانەی کە دوو تەحیاتی تێدایە، لە تەحیاتی یەکەمدا تەحیاتی کورت دەخوێنین و لە تەحیاتی دووەمیشدا تەحیاتی درێژ دەخوێنین.

# ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە

**چەند شتێک هەیە کە دەبنە هۆی بەتاڵبوونەوەی نوێژ، ئەمانە بە کورتی هەندێک لەوانەن:**

١. قسەکردن یان پێکەنین، یان جووڵەیەکی زۆر لەناو نوێژەکەدا.
٢.دەرچوونی هەر شتێک لە پاش و پێشی مرۆڤ.
٣. خواردن یان خواردنەوە لە کاتی نوێژدا.
٤. پەڕاندن بە ئەنقەست، یان ئەنجامنەدانی هەر یەکێک لە مەرجەکان و پایەکان کە بۆ نوێژ پێویستن ﴿لە مەرجەکان و پایەکانی نوێژدا باسکراوە﴾، ﴿واتە: بە زانین و بە ئەنقەستی ڕکووع نەبەیت، یان سووجدەیەک نەبەیت، یان....هتد﴾.
٥.پێش ئیمام بکەویت لە کاتی نوێژی بەکۆمەڵدا.
٦. ڕوو وەرگێڕان لە قیبلە.

# هەندێک شت هەیە کە ئەنجامدانی لە نوێژدا باش نییە و مەکروهە، وەکو:

١. سەیرکردنی لای ڕاست و لای چەپ و جموجوڵی زۆر.
٢. سەیرنەکردنی شوێنی سوجدەکەت یان سەر بەرزکردنەوە و سەیرکردنی ئاسمان.
٣. نوێژکردن بە خێرایی و پەلەکردن لە نوێژدا.
٤. نوێژکردن لە کاتی برسییەتیدا کە خواردن داندرابێت و خەیاڵت لای نانخواردنەکە بێت ﴿واتە دەبێت نانەکەت بخۆیت، پاشان نوێژەکەت بکەیت﴾.
٥. نوێژکردن بە خەواڵوویی.
٦. نوێژکردن لە کاتی تەنگەتاوبووندا کە پێویستی بە چوونە ئاودەست بێت.

# سوجدەی سەهوو

ئـەم سـوجدەیە بریتییە لـە دوو سـوجدە، کاتێک دەبرێت کـە یەکێک لـە ڕوکنەکانـی نوێـژت لەبیـر بچێـت، وەکو ئـەوەی کە لـە کۆتاییدا لـە بیرتچـووە کـە تەحیاتی دووەمت خوێنـدووە یان نا، یـان یەکێک لـە ڕکووعـەکان، یـان سـوجدەکانت ئەنجامنـەداوە، لـەو کاتـەدا کە تەحییاتـی دووەمـت خوێنـد پێـش ئەوەی سـەلام بدەیتـەوە دووجار سـوجدە دەبەیـت، ئەویـش بـەوەی کـە دوای تەواوبوونـی تەحیاتی کۆتایـی ﴿اللّهُ أكبَرُ﴾ دەکەیـن و سـوجدەیەک دەبەیـن و دەڵێین:

﴿سُبحانَ رَبِّيَ الأَعلى﴾ ﴿سوبحانە ڕەببیەلئەعلا﴾

پاشـان ﴿اللّهُ أكبَرُ﴾ دەکەین و لە سـوجدەکە هەڵدەستینەوە، هەروەها ﴿اللّهُ أكبَرُ﴾ یێکـی تر دەکەین و سـوجدەی دووەم دەبەین و دەڵێین:

﴿سُبحانَ رَبِّيَ الأَعلى﴾ ﴿سوبحانە ڕەببیەلئەعلا﴾

پاشـان ﴿اللّهُ أكبَرُ﴾ دەکەیـن و لـە سـوجدەکە هەڵدەسـتینەوە و دواتر سەلام دەدەینەوە.



* بـەلام ئەگـەر بکەویتـە گومانەوە یەکێک لـە ڕکاعەتەکانت ئەنجامنـەداوە، ئـەوا ڕکاعەتێکی تر دەکەیت و پاشـان لەکۆتاییدا سـوجدەی سەهوو دەبەیت و دواتر سەلام دەدەیتەوە.



# هەندێک لەو زیکرانەی کە سوننەتە لە دوای نوێژە فەرزەکان دەخوێنرێن

﴿أَستَغفِرُالله، أَستَغفِرُالله، أَستَغفِرُالله، أَللّهُمَّ أَنتَ السَّلامُ وَمِنكَ السّلامُ تَبارَكتَ يا ذَا الجَلالِ وَالإِكرام﴾.

﴿ئەستەغفیڕوڵڵا، ئەستەغفیڕوڵڵا، ئەستەغفیڕوڵڵا، ئەڵڵاهوممە ئەنتەسسەلام وەمینکە سسەلام تەبارەکتە یا زەلجەلالی وەلئیکرام﴾.

﴿اللّهُمَّ أَعِنِّي عَلى ذِكرِكَ وَشُكرِكَ وَحُسنِ عِبادَتِك﴾.

﴿ئەڵڵاهوممە ئەعیننی عەلا زیکریکە وەشوکریکە وەحوسنی عیبادەتیک﴾.



﴿سبحَانَ الله ٣٣ جار، أَلحَمدُلله ٣٣ جار، الله أَكبَر ٣٣ جار﴾.

(سوبحانەڵلاھ ٣٣ جار، ئەلحەمدولیللاھ ٣٣ جار، ئەڵلاھوئەكبەر ٣٣ جار).

﴿لا إِلهَ إِلا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ وَهوَ عَلى كُلِّ شَىءٍ قَدِير﴾.

﴿لا ئیلاھە ئیللەڵلاھو وەحدەھو لاشـــەریكە لەھـــو، لەھولمولكو وەلەھولحەمدو وەھووە عەلا كوللى شـــەیئین قەدیر﴾.

﴿اللّهُمَّ لا مانِعَ لِما أَعطَيتَ وَلا مُعطِيَ لِما مَنَعتَ وَلا يَنفَعُ ذَا الجَدِّ مِنكَ الجَد﴾.

(ئەڵلاھوممـــە لا مانیعە لیمـــا ئەعطەیتـــە وەلا موعطییە لیمـــا مەنەعتە وەلا یەنفەعـــو ذەلجـــەددی مینكەلجەد).

# ئایەتەلکورسی

* پاشان خوێندنی ئایەتەلکورسی کە سوننەتێکی زۆر گەورەیە.
* خوێندنی سوورەتەکانی:

﴿قل هو الله أحد، الفلق، الناس﴾.

**پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت:** هەر کەسێک لە دوای هەموو نوێژە فەرزەکان ئایەتەلکورسی بخوێنێت، دەچێتە بەهەشتەوە.

٢٥٤ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ
ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ يَعْلَمُ
مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا
بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ
وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ٢٥٥

﴿ئەڵڵاهـــو لا ئیلاهە ئیللا هووەل حەییولقەییوم لا تەئخونوهو ســـینەتووەلا نەوموولـلەهـــو ما فی ســـــەماواتی وەمـــا فیلئەرضی مەن ذەللەذی یەشـــفەعو عیندەهو ئیلـــلا بیئیذنیهی یەعلەمو مـــا بەینە ئەیدیهیم وەمـــا خەلفەهوم وەلا یوحیطونە بیشـــەیئیمین عیلمیهی ئیللا بیماشـــائە وەســـیعە کورسـییوهو ســـــەماواتی وەلئەرضە وەلا یەئودوهو حیفظوهوما وەهوەل عەلییولعەظیم﴾.

# نوێژە فەرزەکان

**بریتیــن لــە پێنج نوێژ لە شــەو و ڕۆژێکــدا و ژمارەیــان حەڤدە ڕکاعەتــە، کە بــە ئەنجامدانیان خێــر و پاداشــتێکی زۆرمان لای خوای گــەورە بۆ دەنوســرێت.**

**دوونوێــژی بەیانــی:** دوو ڕکاعەتــە و لــە ڕکاعەتی دووەمــدا تەحییاتی تێدا دەخوێنرێت و پاشــان ســەلام دەدرێتەوە، لە پێــش خۆرهەڵهاتندا نوێژی بەیانــی ئەنجــام دەدرێت واتە لەگــەڵ خۆرهەڵهاتندا کاتــی نوێژی بەیانی تەواو دەبێــت و نامێنێت.

*** لــە نوێژی بەیانیدا بەپێی مەزهەبی شــافیعی دەبێت لە ڕکاعەتی دووەمدا لە دوای ڕکووع بــردن دووعای قنوت بخوێندرێت.**

**نوێــژی نیــوەڕۆ:** ژمــارەی ڕکاعەتەکانــی چــوار ڕکاعەتــە و دوو ڕکاعەت دەکەیــت و تەحیاتێکــی کورتی تێدا دەخوێنرێت و پاشــان دوو ڕکاعەتی تــر دەکەیت و تەحییاتێکی درێژ دەخوێنیت و پاشــان ســەلام دەدەیتەوە.

**نوێــژی عەســر:** ژمــارەی ڕکاعەتەکانــی چــوار ڕکاعەتــە و دوو ڕکاعەت دەکەیــت و تەحیاتێکــی کورتی تێدا دەخوێنرێت و پاشــان دوو ڕکاعەتی تــر دەکەیت و تەحییاتێکی درێژ دەخوێنیت و پاشــان ســەلام دەدەیتەوە.

**نوێــژی شــێوان ﴿نوێــژی مەغریــب﴾:** ژمــارەی ڕکاعەتەکانی ســێ ڕکاعەتە، لــە کاتــی ئێوارانــدا ئەنجــام دەدرێت، لــە ڕکاعەتــی دووەمــدا تەحییاتی کورت دەخوێنیت و پاشــان هەڵدەســتیتەوە بۆ ڕکاعەتی ســێیەم، پاشان لــە ڕکاعەتــی سێیەمیشــدا تەحییاتــی درێــژ دەخوێنیت، پاشــان ســەلام دەدەیتەوە.

**نوێــژی خەوتنــان ﴿نوێژی عیشــا﴾:** ژمارەی ڕکاعەتەکانی چــوار ڕکاعەتە و لە شــەودا ئەنجــام دەدرێت، دوو ڕکاعەت دەکەیــت و تەحیاتێکی کورتی تێــدا دەخوێنرێــت و پاشــان دوو ڕکاعەتــی تــر دەکەیــت و تەحییاتێکی درێژ دەخوێنیت و پاشــان ســەلام دەدەیتەوە.

**نوێــژی بــە کۆمــەڵ:** نوێژی بــە کۆمەڵ بریتییــە لەو نوێژەی کە کەسـێک ﴿وەکــو ئیمامی مزگەوت﴾ لــە پێش نوێژخوێنەکانــەوە نوێژەکە دەکات و ئەویــش دوای ئــەوەی کە قامــەت دەکرێت ئیمامەکە بــە دەنگی بەرز ﴿اللهُ أَكبَر﴾ دەکات و نوێژخوێنەکانیــش هــەر کەسـێکیان و بــۆ خــۆی بە دەنگــی نــزم ﴿اللهُ أَكبَر﴾ دەکــەن، موســوڵمانان لــە هــەر کۆییــەک بن لە مزگــەوت، یــان ماڵــەوە، یــان لە دەشــتودەر کــە دوو کــەس و زیاتر بــوون کۆبوونــەوە ســوننەتە نوێژەکەیــان بــە کۆمەڵ بکــەن، ئیمام لە نوێــژی مەغریــب و خەوتنــان و بەیانــی و نوێــژی هەینیــدا خوێندنــی ســوورەتی ﴿الفاتحه﴾بــە دەنگــی بــەرز دەخوێنێــت، نوێژخوێنــەکان بێدەنــگ دەبن و گــوێ لە قورئانەکە دەگــرن. ئیمامەکە چــۆن نوێژەکە دەکات، نوێژخوێنەکانیــش وەکــو ئــەو نوێژەکــە دووبــارە دەکەنــەوە، هەروەهــا لــەو نوێژانــەدا کــە دەنــگ بەرزدەکرێتــەوە تێیــدا کاتێــک ئیمامەکــە ســوورەتی ﴿الفاتحــه﴾ی تەواوکــرد و وتــی: ئامیــن، دەبێت نوێژخوێنەکانیــش بــە دەنگێکی کەمێــک بەرز بڵێن: ئامیــن. پێغەمبەری خــودا ﷺ لە فەرموودەیەکدا باســی خێری نوێژی بــە کۆمەڵ دەکات کە بــە بیســت و حــەوت پلە لە نوێــژی تــاک گەورەترە و خێــری زیاترە.

**هەروەها چەند کارێک هەیە کە نابێت لە نوێژی بەکۆمەڵدا بیکەین، ئەوانیش:**

- لــە کاتــی دامەزراندن و دەســتپێکردنی نوێژدا نابێت خۆمان بە شــتی ترەوە ســەرقاڵ بکەین.

- نابێــت لــە کارەکانــی نوێژدا پێشــی ئیمام بکەوین، وەکــو ئەوەی پێش ئیمامەکــە بچینە ڕکــووع، یان بچینە ســوجدە و...هتد.

- نابێــت لــە مزگــەوت و لــە کاتی نوێــژدا دەنگەدەنگ بکەیــن و نوێژ لە نوێژخوێنــەکان تێک بدەین.

**نوێــژی هەینــی:** ئەم نوێــژە لە نیــوەڕۆی ڕۆژی هەینیدا ئەنجــام دەدرێت، ئەویــش دوای ئەوەی وتاربێــژ ﴿**خطیب**﴾ دوو وتار دەخوێنێتەوە، دوای ئــەوە دوو ڕکاعــەت نوێــژی هەینی بــە جەماعەت دەکــەن. **﴿ئەم نوێژە تەنها لەســەر پیاوان فەرزە و لەســەر ئافرەتــان فەرز نییە﴾.**

# خشتەی نوێژەکان

| ژمارە | ناوی نوێژەکان | ژمارەی ڕکاعەتەکان | ئەو ڕکاعەتەی تەحیاتی تێدا دەخوێنرێت | سوننەتی موئەکەدە* پێش نوێژ | سوننەتی موئەکەدە* دوای نوێژ |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | بەیانی | 2 | 2 | 2 ڕکاعەت | - |
| 2 | نیوەڕۆ | 4 | 2 و 4 | 4 ڕکاعەت | 2 ڕکاعەت |
| 3 | عەسر | 4 | 2 و 4 | - | - |
| 4 | ئێوارە | 3 | 2 و 3 | - | 2 ڕکاعەت |
| 5 | خەوتنان | 4 | 2 و 4 | - | 2 ڕکاعەت، نوێژی وەتر* |

* سوننەتی موئەکەدە ئەو سوننەتانەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوامبووە لەسەریان.

* نوێژی وەتر ژمارەی ڕکاعەتەکانی تاکە ﴿واتە ٣ ڕکاعەت یان ٥ ڕکاعەت یان زیاتر دەبێت﴾، کە لە دوای نوێژی عیشا دەبێت ﴿ئەمیش سوننەتێکی موئەکەدەیە﴾.



# سُورَةُ الفَاتِحَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾
ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾
ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾
إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهْدِنَا
ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ
عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ
وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾

**واتــه:** بـه نـاوی خـودای میهرەبـان و بەخشـندەی نیعمەتی گەورە
و بچـووک ﴿١﴾ هەرچـی سـتاییش و سوپاسـه بـۆ ئـەو خودایـه کـه
نـاوی ﴿الله﴾یـەو پـەروەردگاری هەمـوو عالەم خۆیەتـی ﴿٢﴾ خودای
میهرەبـان و بەخشـندەی نیعمەتـی گەورە و بچـووک ﴿٣﴾ که خاوەنی
جـەزا و پاداشـتی بیروبـاوەڕ و کردەوەیـه لـه ڕۆژی قیامەتـدا ﴿٤﴾
خودایـه! هـەر تـۆ دەپەرسـتین و بەندەیـی بـۆ تـۆ دەکەیـن و هەر
لـه تـۆ داوای یارمەتـی دەکەین ﴿٥﴾ بمانخەرە سـەر ڕێگای ڕاسـت و
داد، ڕێـگای بەختیاریی هـەردوو جیهان ﴿٦﴾ ڕێگای ئەوانـەی نیعمەتت
پێـداون، نـەک غـەزەب لێگیـراوان و ڕێ ونکـردووان ﴿٧﴾ ئامین.

ترتيبها ١١٢ سُورَةُ الإخلاص آياتها ٤

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ١ اللَّهُ الصَّمَدُ ٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ٣
وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ٤

## بیسمی للاهی ڕەحمانی ڕەحیم

﴿قـــول هووەڵڵاهو ئەحـــەد، ئەڵڵاهـــو صەمەد، لـــەم یەلیـــد وەلـــەم یولـــەد، وەلـــەم یەکوللەهو کوفـــووەن ئەحەد﴾.

**واتـــە: تۆ ئەی موحەممـــەد بڵێ:** ئەو شـــتەی من ئێـــوەی بۆ بانـــگ دەکـــەم ئەوەیە کە خـــودا تاک و تەنیایـــە ١ هـــەر ئەو خوایە لـــە تەنگانەدا پپشـــت و پەنایـــە ٢ کەســـی لێ نەبووە و لە کەســـیش نەبووە و ٣ کەســـیش هاوچەشـــن و هاوپایەی نییە ٤.

آياتها ٥ — سُورَةُ الفَلَقِ — ترتيبها ١١٣

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ
غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾
وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾

## بیسمی للاهی ڕڕەحمانی ڕڕەحیم

﴿قول ئەعوذو بیڕەببیل فەلەق، من شەڕری ما خەلەق، وەمین شەڕری غاسیقین ئیذا وەقەب، وەمین شەڕری ننەففاثاتی فیلعوقەد، وەمین شەڕری حاسیدین ئیذا حەسەد﴾.

**واتە: تۆ ئەی موحەممەد بڵێ:** من پەنا دەگرم بە پەروەردگاری ڕووناکیی بەرەبەیان(١) لە شەڕ و خراپەی هەرچی ئەو پەروەردگارە دروستی کردووە و(٢) لە شەڕ و خراپەی تاریکە شەو کە ئەو تاریکەشەوە دەچێتە ناو هەموو شتێکەوە، واتە لەو شەڕ و خراپانەی لە تاریکە شەودا ڕوودەدەن(٣) لە شەڕ و خراپەی ژنانی جادووگەریش کە تاڵە بەن و دەزوو گرێ دەدەن و فووی پێدا دەکەن و وردەتفی لێ دەپرژێنن(٤) لە شەڕ و خراپەی مرۆڤی حەسوودیش لە کاتی حەسەدبردنەکەیاندا(٥).

ترتيبها ١١٤ — سُورَةُ النَّاسِ — آياتها ٦

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ
ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى
يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾
مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾

**بیسمی للاهی ڕڕەحمانی ڕڕەحیم**

﴿قول ئەعونو بیڕەببیننـاس، مەلیکیننـاس، ئیلاهیننـاس، مین شەرریلوەسواسـیل خەنناس، ئەللەذی یووەسویسـو فی صودورینناس، مینەلجیننەتـی وەنناس﴾.

**واتە: تۆ ئەی موحەممەد بڵێ:** من پەنا دەگرم بە پەروەردگاری هەموو ئادەمیزاد و پەرییان.﴿١﴾ ئەو پەروەردگارەی کە پادشای هەموو ئادەمیزاد و پەرییانە.﴿٢﴾ ککە خوا و پەرستراوی هەموو ئادەمیزاد و پەرییانە ﴿واتە دەبێت هەموویان بیپەرستن، هەرچەندە هەندێکیشیان نەیپەرستن﴾﴿٣﴾ پەنا دەگرم بەو خوایە لە شەڕ و خراپەی ئەو شەیتانە وەسوەسەخەرە دڵانە کە هەر کە ناوی خودا هێنرا دەکشێتە دواوە﴿٤﴾ ئەو شەیتانە کە وەسوەسە و وتوویرە دەخاتە سنگی خەڵک﴿٥﴾ لە پەری و ئادەمیزاد﴿٦﴾.

ترتيبها ١٠٣ — سُورَةُ العَصْرِ — آياتها ٣

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلْعَصْرِ ١ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِى خُسْرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ٣

**بیسمی للاهی ڕڕەحمانی ڕڕەحیم**

﴿وەلعەصرِ، ئیننەل ئینسانە لەفی خوسرٍ، ئیللەلەزینە ئامەنو وەعەمیلو صصالیحاتی وەتەواصەو بیلحەققی وەتەواصەو بیصصەبرِ﴾.

**واتە**: قەسەم بە چەرخی زەمان!(١) بەڕاستی هەموو ئادەمیزاد ژین بە خەسار و زەرەرمەندن(٢) تەنها ئەوانەیان نەبێت ئیمانیان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە و یەکتریان ڕاسپاردووە بیروباوەڕ و گوفتار و ڕەفتاریان ڕاست و دروست بێت و یەکتریان ڕاسپاردووە لە بەرامبەری گوناهدا خۆیان بگرن و نەیکەن، یا کە لە ڕێی خودادا تووشی بەڵا هاتن خۆیان بگرن(٣).

# هەندێک لە نوێژە سوننەتەکان



١. **نوێژی چێشتەنگاو** ﴿صَلاةُ الضُّحى﴾:

بریتییە لە چەند ڕکاعەتێک لە نوێژی سوننەت کە کاتەکەی لە دوای هەڵهاتنی خۆر و بەرزبوونەوەی خۆر بە ئاستی ڕمێک دەستپێدەکات و تاکو نزیکەی نیو سەعاتێک پێش نوێژی نیوەڕۆ بەردەوام دەبێت و دەتوانرێت ٢ ڕکاعەت تاکو ٨ ڕکاعەت بە دوو ڕکاعەت دوو ڕکاعەتی ئەنجام بدرێت.

٢. **نوێژی جەژنەکان:**

بریتییە لە دوو ڕکاعەتی نوێژ کە سوننەتێکی گەورەیە، بۆ جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان ئەنجام دەدرێت، کە لە ڕکاعەتی یەکەمدا پێش خوێندنی سوورەتی ﴿الفاتِحَة﴾، ﴿٧جار﴾ ﴿اللهُ أكبَر﴾و، لە ڕکاعەتی دووەمدا ﴿٥جار﴾﴿اللهُ أكبَر﴾ دەوترێت، لە دوای نوێژەکە ئیمام و وتاربێژەکە وتارێک دەخوێنێتەوە. هەروەها سوننەتە جل و بەرگی جوان لەبەر بکرێت و هەموو کەسێک خۆی بۆنخۆش بکات.

٣. **نوێژی نیاز و داوای چاکەکردن لە خوای گەورە** ﴿صَلاةُ الإستِخارَة﴾:

ئـەم نوێـژە بریتییـە لـە دوو ڕکاعەت نوێـژی سـوننەت، کاتێـک ئەنجام دەدرێـت کە ئەگەر کەسـێک ویسـتی هەر کارێـک ئەنجام بدات، سـەرەتا دەسـتنوێژدەگرێت و پاشـان دوو ڕکاعەت نوێژی سـوننەت دەکات و پاش سـەلامدانەوەی لە نوێژەکـەی ئەم نزایـە دەخوێنێت:

﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقدِرُ وَلا أَقدِرُ وَتَعلَمُ وَلا أَعلَمُ وَأَنتَ عَلاَّمُ الغُيوبِ. اَللَّهُمَّ إن كُنتَ تَعلَمُ أَنَّ هذا الأمرَ خيرٌ لي في ديني وَمَعاشي وَعاقِبَتِ أمري ﴿عاجِلِ أَمري وَآجِلِهِ﴾ فَاقدُرهُ لي وَيَسِّرهُ لِي ثُمَّ بارِك لي فيهِ وَإن كُنتَ تَعلَمُ أَنَّ هذا الأمرَ شَرٌّ لي في ديني وَمَعاشي وَعاقِبَتِ أَمري (عاجِلِ أَمري وَآجِلِهِ) فَاصرِفهُ عَنّي وَاصرِفني عَنهُ وَاقدُر لِيَ الخَيرَ حَيثُ كانَ ثُمَّ أَرضِني بِه- **پاشان ناوی کار و پێداویسـتییەکەی بڵێت-**﴾.

* ئەڵڵاهوممە ئیننی ئەسـتەخیرۆکە بیعیلمیکە، وە ئەستەقدیرۆکە بیقودرەتیکە، وە ئەسـئەلوکە مین فەضلیکەلعەظیم، فەئیننەکە تەقدیرو وەلا ئەقدیر، وەتەعلەمو وەلائەعلـەم، وەئەنتە ئەعللامولغیـوب، ئەڵڵاهوممە ئین کونتـە تەعلەمو ئەننە هانەلئەمـرە خەیرۆللـی فی دینی وەمەعاشـی وەعاقیبەتی ئەمـری ﴿عاجیلی ئەمری وەئاجیلیهی﴾ فەقدورهولی وەیەسسـیرهو لی ثوممـە باریک لی فیهی، وەئین کونتـە تەعلەمو ئەننـە هانەلئەمرە شـەڕڕولی فی دینی وەمەعاشـی وەعاقیبەتـی ئەمـری ﴿عاجیلـی ئەمـری وەئاجیلیهی﴾ فەصریفهـو عەننی وەصریفنی عەنهـو وەقدورلییەلخەیـرە حەیثو کانە ثوممـە ئەرضینی بیهی.

* هـەر کەسـێک بـە دڵنیاییـەوە ئەم نوێـژ و دوعایە بخوێنێـت؛ ئەوا بە دڵنیاییـەوە خوای گەورە کام شـتەی باشـە ئـەوەی بۆ دەکات.

### ٤. نوێژی خۆرگیران و مانگگیران ﴿الخُسوف وَالكُسوف﴾:

ئەویش کاتێکە کە دیاردەی خۆرگیران یان مانگگیران ڕوودەدات، بە وتنی: ﴿الصَّلاةُ جامِعَة﴾ خەڵکی بۆ کۆدەکرێتەوە و سوننەتە ئیمام دەنگ بەرزبکاتەوە تێیدا و ئەویش ئەنجامدانی دوو ڕکاعەت نوێژە و لە هەموو ڕکاعەتێکدا دوو چەمینەوە ﴿الركوع﴾ ئەنجام دەدرێت و لە نێوانی چەمینەوەکاندا سوورەتی ﴿الفاتِحَة﴾ دەخوێنرێت. دوای نوێژەکەش ئیمامەکە وتارێک پێشکەش دەکات، سوننەتە لەو کاتەدا خێر و چاکەی زۆر بکرێت لە پاڕانەوە و وتنی زیکرەکان و داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە.

### ٥. نوێژە بارانە ﴿صَلاةُ الإستِسقاء﴾:

سوننەتە لە کاتی باران نەبارینــدا بکرێت و ئەم نوێژە لە دەرەوەی شار ئەنجام دەدرێت و دوو ڕکاعەتە و لە دواییدا ﴿یان لە پێشییەوە﴾ ئیمام وتارێک دەخوێنێتەوە و باسی یادی خوای گەورە دەکات و موسوڵمانان هاندەدات بۆ فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵیکردنی خوای گەورە، ئیمام و ئەوانەی کە نوێژەکە ئەنجام دەدەن زۆر داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەن و دەپاڕێنەوە بۆ ئەوەی باران ببارێت و ئیمام پۆشاکەکەی بە هەڵگەڕاوەیی لەبەر دەکات و ئەم دوعایەش یەکێکە لەو دوعایانەی کە دەیکەن:

﴿أَللَّهُمَّ أَغِثنا، أَللَّهُمَّ أَغِثنا، أَللَّهُمَّ أَغِثنا﴾.

﴿ئەڵڵاهوممە ئەغیثنا، ئەڵڵاهوممە ئەغیثنا، ئەڵڵاهوممە ئەغیثنا﴾.

**واتە:** ﴿خودایە بارانمان بۆ ببارێنە و فریامان بکەوە﴾، .... .

# بەشی دووەم

## سوننەتەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ



## لە کاتی هەستان لە خەودا

**لە کاتی هەستان لە خەودا سوننەتە بڵێین:**

﴿أَلحَمدُ للهِ الَّذي أَحيانا بَعدَما أَماتَنا وَإِلَيهِ النُّشور﴾.

﴿ئەلحەمدو لیللاهی للەذی ئەحیانا بەعدە ما ئەماتەنا وەئیلەیهی ننوشور﴾.

**واتە:** سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ژیاندینیەوە دوای ئەوەی کە مراندبووینی و زیندووبوونەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

# دوعای پێش خەوتن

**کاتێک دەچینە سەر جێگا بۆ خەوتن سوننەتە بڵێین:**

﴿بِسمِكَ اللّهُمَّ أَمُوتُ وَأَحيا﴾.

﴿بیسمیکەڵڵاهوممە ئەموتو وەئەحیا﴾.

**واتە: خودایە لەسەر یادی ناوی تۆ دەمرم و دەژیم.**



* **سوننەتە لەسەر لای ڕاست بخەویت.**

* لە کاتی خەوتندا خوێندنی ئایەتەلکورسی سوننەتە و سوورەتەکانی ﴿قل هو الله أحد والفلق والناس﴾ بخوێنە و فوو بکە بە دەستەکانتدا و بیهێنە بە هەموو جەستەتدا.

* خوێندنی زیکرەکانی ﴿سُبحانَ الله ٣٣ جار، الحَمدُلله ٣٣ جار، اللهُ أكبَر ٣٤ جار﴾.

# ئەگەر خەوێکی ناخۆشت بینی

* ئەگەر خەونی ناخۆشت بینی و ڕاچڵەکیت ئەوا:

١. سێ جار پرژەی وەکو تف «فوویەکی تەڕبێت» بە لای چەپدا بیکە .

٢. پەنا بگرە بە خوای گەورە لە خراپەی ئەو خەونە ناخۆشەی کە بینیوتە.

٣. ئاراستە و شوێنی خەوتنەکەت بگۆڕە و بکەوەرە سەر لایەکەی تر.

٤. ئەگەر ویستت هەستە و دوو ڕکاعەت نوێژ بکە.

٥. خەونەکەت لای کەس مەگێڕەرەوە.

٦. هەوڵبدە سێ جار هەناسەی قووڵ بە لوت هەڵبمژیت و بە هێواشی لەڕێگەی دەمەوە هەناسە بدەیتەوە، بەم شێوەیە دەتوانیت زاڵبیت بەسەر خۆتدا.



# لە کاتی باوێشکدا

**ئەگەر باوێشکت هات پشتی دەستت بخەرە سەر دەمت و بڵێ:**

﴿أَعوذُبِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ﴾.

﴿ئەعونو بیللاهی مینەششەیطانی ڕڕەجیم﴾.

**واتە:** پەنا دەگرم بە خودا لە شەیتانی دەرکراو لە ڕەحمەتی.



باوێشکدان زۆربەی کات بەهۆی کەمی خەو یان زۆر خەوتنەوە ڕوودەدات، وەهێندێک جار بە هۆی خاوبوونەوەی جەستە و جووڵەی خوێنەوە ڕوودەدات، دەبێت لەکاتی باوێشکداندا دەستەکانمان بخەینە سەردەممان، بۆئەوەی هەوای پیس و میکرۆبەکانی ناو هەوا هەڵنەمژین و بۆنی ناخۆش بۆ دەوروبەرەکەمان بڵاونەکەینەوە.

# له کاتی سڵاوکردندا

**له کاتی تێپەڕین و ڕۆیشتن به لای کەسێک یان کۆمەڵێک خەڵکدا دەڵێین:**

(السَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ).

(ئەسسەلامو عەلەیکوم وەڕەحمەتوڵڵاهی وەبەڕەکاتوهو).

**واته:** ئاشتی و سۆز و ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورەتان لێبێت.



# وەڵامدانەوەی سەلام

**ئەگەر کەسێک سەلامی لێ کردیت سوننەتە وەڵامی بدەیتەوە و بڵێیت:**

﴿وَعَلَيكَ السَّلامُ وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ﴾.

﴿وە عەلەیکە سسەلام وەڕەحمەتوڵڵاهی وەبەڕەکاتوهو﴾.

**واته:** ئاشتی خوای گەورە و سۆز و ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورەت لەسەربێت.

# لە کاتی دڵخۆشیدا

**ئەگەر کارێک ڕوویدا بە شێوەیەک بوو کە دڵخۆشیکردین و پێمان خۆشبوو دەڵێین:**

﴿أَلحَمدُللهِ الَّذي بِنِعمَتِهِ تَتِمُّ الصّالِحاتُ﴾.

﴿ئەلحەمدولیللاهی للەذی بینیعمەتیهی تەتیمموصصالیحات﴾.

**واتە**: هەموو سوپاس و ستاییش بۆ ئەو خودایەی کە بە نیعمەتی ئەوەوە هەموو چاکەکان تەواو دەبێت.



# له كاتى سه‌يركردنى ئاوێنه‌دا

**له كاتى سه‌يركردنى ئاوێنه‌دا سوننه‌ته بڵێيت:**

﴿اللَّهُمَّ أَنْتَ حَسَّنْتَ خَلْقِي فَحَسِّنْ خُلُقِي وَحَرِّمْ وَجْهِيَ عَلَى النَّارِ﴾.

﴿ئه‌ڵڵاهومه ئه‌نته حه‌سسه‌نته خه‌لقى فه‌حه‌سسين خولوقى وه‌حه‌رريم وه‌جهييه عه‌له‌ننار﴾.

**واته:** خودايه منت جوان دروستكردووه و ڕه‌وشتم جوان بكه و ڕووخسارم له ئاگر بپارێزه.



# له کاتی نانخواردن

**سوننەته له پێش نانخواردندا بڵێیت:**

﴿اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَأَطْعِمْنَا خَيْراً مِنْهُ﴾.

﴿ئەڵڵاهوممە باریک لەنا فیهی وەئەطعیمنا خەیرەن مینهو﴾.

**واتە:** خودایە بەرەکەت برژێنە بەسەرماندا و لەم خواردنە چاکترمان بدەرێ.

**پاشان کە دەستت بە نانخواردن کرد بڵێ:**

﴿بِسْمِ اللهِ﴾. ﴿بیسمی للاهـ﴾.

**واتە:** بە ناوی خودا.



**بەڵام ئەگەر لە بیرتچوو، هەرکاتێک بیرتکەوتەوە بڵێ:**

﴿بِسمِ اللهِ فِي أَوَّلِهِ وَآخِرِهِ﴾.

﴿بیسمیللاهی فی ئەووەلیهی وە ئاخیریهی﴾.

**واتە:** بە ناوی خوای گەورە لە سەرەتا و کۆتاییدا.

**لە دوای تەواوبوون و دەستهەڵگرتن لە نانخواردن سوننەتە بڵێیت:**

﴿الحَمدُ للهِ الَّذِي أَطعَمَنا وَسَقانا وَجَعَلنا مُسلِمِين﴾.

﴿ئەلحەمدولیللاهی للەذی ئەطعەمەنا وە سەقانا وەجەعەلنا موسلیمین﴾.

**واتە:** سوپاس بۆ خودا کە خواردن و ئاوی پێداین و ئێمەی کردە موسوڵمان.

**هەروەها وا باشە لە کاتی نانخواردندا ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەین:**

- لە بەردەمی خۆتەوە نان بخۆیت.
- هەروەها چەندت خواردن بۆ خورا ئەوەندە خواردن بکەیتە ناو دەفری بەردەمی خۆتەوە، نەوەک ئەوەندە زۆر بێت کە دوایی فڕێ بدرێت، ئەمەش بۆ ئەوەی زیادەڕەوی تێدا نەکرێت.
- لە کاتێکدا پاروویەک نان لە دەمتدایە قسە نەکەیت باشە، نەوەکو لە قوڕگت بگیرێت، یان پارچەیەک لە خواردنەکە بپەڕێتە دەرەوە بۆ سەر سفرەکە.
- لە پێش ئەوەی بخەوین خواردنی زۆر و خواردنی قورس نەخۆین، چونکە بۆ تەندروستیمان خراپە، هەروەها خەونی ناخۆشیش دەبینین.
- لە پێش و لە دوای نانخواردندا دەستەکانت بە ئاو و سابوون بشۆریت.

# له كاتی ئاو خواردنەوەدا

**پێش ئاوخواردنەوە سوننەتە بڵێیت:**

﴿بِسمِ اللهِ﴾. ﴿بیسمی للاهـ﴾.

**واتە:** بە ناوی خودا.

**دوای ئاو خواردنەوە سوننەتە بڵێیت:**

﴿أَلحَمدُلله﴾.

﴿ئەلحەمدولیللاهـ﴾.

**واتا:** سوپاس بۆ خودا.



**پێغەمبەری ئازیزمان لە بارەی ئاو خواردنەوەوە ئامۆژگاریمان دەکات و دەفەرموێت:**

١. با گەدەمان بکەین بە سێ بەشەوە، بەشێکی بۆ خواردن و بەشێکیشی بۆ ئاو و بەشی سێیەمی بەتاڵ بێت.

٢. لەکاتی ئاو خواردنەوەدا دەبێت دابنیشین و بە پێوە نەبین بۆ هەوا.

٣. دەبێت ئاو خواردنەوەمان بە هێمنی بێت و لەسەرخۆ ئاو بخۆینەوە.

٤. دەبێت بە سێ جار ئاو بخۆینەوە نەک بە یەک جار هەمووی بخۆینەوە، واتا دەبێت ئەو جامە یان ئەو پەرداخە ئاوەی دەمانەوێت بیخۆینەوە بە سێ جار تەواوی بکەین، دەبێت هێدی هێدی بیخۆینەوە.

# ئەگەر کارێکت ویست و سەرینەگرت و وا دەرنەچوو

ئەگەر کارێکمان ویست و سەرینەگرت و وا دەرنەچوو کە دەمانەوێت؛ ئەوا دڵنیابین کە خێری تێدایە بۆمان و سوننەتە بڵێین:

﴿قَدَرُ اللهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ﴾ ﴿قەدەرولڵاهی وەما شائە فەعەلە﴾.

واتە: ئەمە بڕیاری خودا بوو ئەو شتەی ویستی بوو کردی و ئەنجامیدا.



# کاتی چوونە ئاودەست

**کاتی چوونە ئاودەست قاچی چەپ پێش بخە و بڵێ:**

﴿بِسمِ اللهِ اللّهُمَّ إِنّي أَعوذُبِكَ مِنَ الخُبثِ وَالخَبائِث﴾.

﴿بیسمی للاهـ، ئەڵڵاهوممە ئیننی ئەعونوبیکە مینەلخوبثی وەلخەبائیث﴾.

**واتــە:** بــە نــاوی خــوا، خودایــە پەنــات پێ دەگــرم لــە شــەیتانە نێر و مێیەکان.



# کاتی هاتنە دەرەوە لە ئاودەست

**لە کاتی هاتنە دەرەوە لە ئاودەست قاچی ڕاست پێش بخە و بڵێ:**

﴿غُفرانَكَ﴾. ﴿غوفرانەکە﴾.

**واتە:** خودایە داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم.

* وا باشە لە ئاودەستدا قسە نەکرێت، مەگەر زۆر ناچاربێت.
* هەرگیز بە پێوە میز نەکرێت و هەر بە دانیشتنەوە بێت، چونکە باش نییە و جلوبەرگەکەشت بە پاکوخاوێنی نامێنێتەوە و پیس دەبێت.
* زۆر گرنگە کە پاکوخاوێنی خۆت و جل و بەرگەکەت ڕابگریت، لە هەر کاتێکدا بێت، بە تایبەتی لە کاتی چوونە ئاودەستدا.
* لە دوای تەواوبوونت ئاو بە دوای خۆتدا بکە، تاکو هیچ پاشەڕۆیەک نەمێنێت و شوێنەکە پاکوخاوێن بێت.
* لەبیرت نەچێت کە هەموو کاتێک دوای هاتنەدەرەوەت لە ئاودەست دەستەکانت بە ئاو و سابوون بشۆریت.



# له كاتى لەبەركردنى جلوبەرگدا

**لەكاتى لەبەركردنى جلوبەرگدا لە پێشدا لای ڕاست لەبەربکە و پاشان بڵێ:**

﴿أَلحَمدُللهِ الَّذي كَساني هذا وَرَزَقَنيهِ مِن غَيرِ حَولٍ مِنّي وَلا قُوَّةٍ﴾.

﴿ئەلحەمدولیللاهی للەذی کەسانی هانا وەڕزەقەنیهی مین غەیری حەولین میننی وەلا قووەتین﴾.

**واتە:** ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم پۆشاکەی پۆشیم و پێی بەخشیم بەبێ هیچ گۆڕان و هەوڵ و توانای خۆم.



* هەروەها لەکاتی لەپێکردنی پێڵاو و نەعلیشدا لە سەرەتادا قاچی لای ڕاستت لەپێ بکە.

## لە کاتی داکەندنی جلوبەرگ

**لە کاتی داکەندنی جلوبەرگدا سوننەتە بڵێین:**

﴿بِسمِ اللهِ﴾. ﴿بیسمی للاهـ﴾.

**واتە:** بەناوی خودا.

## لەبەرکردنی جلوبەرگی نوێ

**سوننەتە لەکاتی لەبەرکردن و پۆشینی جلوبەرگی نوێدا بڵێیت:**

﴿اللَّهُمَّ لَكَ الحَمدُ، أَنتَ كَسَوتَنيهِ، أَسأَلُكَ مِن خَيرِهِ وَخَيرِ ماصُنِعَ لَهُ، وأَعوذُبِكَ مِن شَرِّهِ وَشَرِّ ماصُنِعَ لَهُ﴾.

﴿ئەڵڵاهوممە لەکەلحەمدو، ئەنتە کەسەوتەنیهی، ئەسئەلوکە مین خەیریهی وەخەیری ما صونیعە لەهو، وە ئەعوذو بیکە مین شەرریهی وەشەرری ما صونیعە لەهو﴾.

**واتە:** خودایە ستاییش هەر بۆ تۆیە، تۆ ئەم پۆشاکەت بە من بەخشیوە، داوات لێدەکەم کە بەشم بدەیت لە خێر و چاکەی ئەم پۆشاکە و لە خێری ئەو شتەیش کە ئەم پۆشاکەی بۆ دروستکراوە و پەنادەگرم بە تۆ لە خراپە و شەڕی ئەمە و لە شەڕ و خراپەی ئەو شتەیش کە ئەمەی بۆ دروستکراوە.

# کاتی تووڕەبووندا

**لە کاتی تووڕەبووندا دەڵێین:**

﴿أَعوذُبِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم﴾.

﴿ئەعوذو بیللاهی مینەششەیطانی ڕڕەجیم﴾.

**واتە:** پەنا دەگرم بە خودا لە شەیتانی دەرکراو لە ڕەحمەتی.



- پێغەمبەری ﷺ ئازیزمان ئامۆژگاریمان دەکات لەکاتی تووڕەبووندا باشترین کارێک کە بیکەین دوو ڕکات نوێژی سونەتە بۆ ئەوەی بەسەر هەستە خراپەکانماندا زاڵبین.

- تووڕەبوون یەکێکە لەو شتانەی کە زیانێکی زۆرمان پێدەگەیەنێت.

- لە کاتی تووڕەبووندا هیچ کاتێک ناتوانین بڕیاری ڕاست و دروست یان کارێکی ڕاست ئەنجام بدەین.

- هەمیشە دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک بەسەر تووڕەبوونەکەدا پەشیمانی ڕوودەکاتە ئەو کەسەی کە تووڕەبووە.

# له کاتی چوون بۆ بازاڕ

له کاتی چوون بۆ بازاڕ سوننەتە بڵێین:

﴿لا إلهَ إلاّ اللهُ وَحدَهُ لاشَريكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ، يُحيي وَيُميتُ وَهُوَحَيٌّ لا يَموتُ بيدِهِ الخَيرُ وَهُوَعَلى كُلِّ شيءٍ قَدير﴾.

﴿لا ئیلاهــە ئیللەڵڵاهــو وەحدەهــو لا شــەریکە لەهــو. لەهولمولکو وەلەهولحەمــدو یوحییی وە یومیتو بییەدیهی لخەیــرو وەهووەحەییو لا یەموتــو وەهووە عــەلا کوللی شــەیئین قەدیر﴾.



واتە: هیچ پەرســتراوێک نییە بە حەق جگە لە ﴿الله﴾، تاک و تەنها و بێ هاوەڵــە و هەموو موڵک و ســوپاس و ســتاییش بۆ ئــەوە و ئەژیەنێت و ئەمرێنێــت و خۆی زیندووە و هەرگیــز نامرێت. هەموو خێر و چاکەیەک بە دەســت ئەوە و بەســەر هەموو شــتێکدا بە توانا و دەستەڵاتدارە.

# دوعای چوونە دەرەوە لە ماڵ

لەکاتی چونە دەرەوە لەماڵدا سوننەتە بڵێیت:

﴿بِسمِ اللهِ، تَوَكَّلتُ عَلى اللهِ، لاحَولَ وَلاقُوَّةَ إلاّبِالله﴾.

﴿بیسمی للاهی، تەوەککەلتو عەلەڵلاهی لا حەولە وەلا قووەتە ئیللا بیللاهـ﴾.

واتــە: بــە ناوی خودا، پشــتم بە خــودای گەورە بەســت، هیــچ هەوڵ و هێزێــک نییــە مەگەر بــە خوای گــەورە نەبێت.



* هەرکاتێــک دەچیــت بۆ ماڵێک لــە دەرگاکە بدەیت پێــش ئەوەی بچیتە ژوورەوە، تەنانــەت ئــەو کاتــەش کــە دەرگای ماڵەکــە کــراوەش بێــت، ئەگــەر ماڵەکــە کەســی نزیکیشــت بێــت، هەروەهــا دەبێت خــاوەن ماڵ ڕێگــەت بــدات و فەرمــووت لــێ بکات ئــەو کاتە بچیتــە ژوورەوە.

# لە کاتی گەڕانەوە بۆ ماڵ

**لە کاتی گەڕانەوە بۆ ماڵ سوننەتە بڵێین:**

﴿بِسمِ اللهِ وَلَجنا وَبِسمِ اللهِ خَرَجنا وَعَلى اللهِ رَبِّنا تَوَكَّلنا﴾.

﴿بیسمی للاهی وەلەجنا وەبیسمی للاهی خەڕەجنا وەعەلەڵڵاهی ڕەببینا تەوەککەلنا﴾.

**واتە: بە ناوی خودا چووینە ژوورەوە و بە ناوی خودا هاتووینەتە دەرەوە و پشتمان بە خودای پەروەردگارمان بەست.**

* پاشان کە چوویتە ژوورەوە سەلام لە ئەندامانی خێزانەکەت بکەیت.



# ئەگەر لە چاوی کەسێک ترسایت

* ئەگەر لە چاوی کەسێک ترسایت پەنا بگرە بە خودای گەورە و میهرەبان سوورەتی ﴿الفلق﴾ و ﴿الناس﴾ بخوێنە.

# دوعای چوونە ناو مزگەوت

**سوننەتە بۆ چوونە ناو مزگەوت قاچی ڕاستت پێشبخەیت و بڵێیت:**

﴿بِسمِ اللهِ، وَالصّلاةُ وَالسّلامُ عَلى رَسولِ اللهِ اللّهُمَّ
افتَح لي أَبوابَ رَحمَتِكَ﴾.

﴿بیســمی للاهـ، وەصصەلاتو وەسســەلامو عەلا ڕەسوولیللاهـ،
ئەڵڵاهوممەفتــەح لی ئەبوابــە ڕەحمەتیکە﴾.

**واتـە:** بـە نـاوی خـودای گـەورە، صـەڵات و سـەلام لەسـەر پێغەمبـەری ﷺ خـودا، خودایـە دەرگاکانـی ڕەحمەتـی خۆتـم لێ بکـەرەوە.



# له كاتى هاتنه دەرەوە له مزگەوت

سوننەتە لە كاتى هاتنە دەرەوە لە مزگەوت قاچى چەپت پێشبخەیت و بڵێیت:

﴿بِسمِ اللهِ، وَالصّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى رَسولِ اللهِ اللّهُمَّ إنِّي أَسألُكَ مِن فَضلِكَ، اللّهُمَّ أعصِمني مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ﴾.

﴿بیسمی للاهـ، وەصصەلاتو وەسسەلامو عەلا ڕەسوولیللاهـ ئەڵڵاهوممە ئیننی ئەسئەلوکە مین فەضلیکە، ئەڵڵاهوممە ئەعصیمنی مینەشەیطانی ڕڕەجیم﴾.

واتە: بە ناوی خودای گەورە، صەلات و سەلام لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ)، خودایە من فەزڵی خۆتت لێ داوادەکەم، خودایە بمپارێزە لە شەیتانی نەفرەت لێکراو.



# ئەگەر کارێکت لەسەر گران بوو

ئەگەر کارێکت لەسەر گران بوو سوننەتە بڵێیت:

﴿اللّهُمّ لا سَهلَ إلاّ ما جَعَلتَهُ سَهلاً، وَأَنتَ تَجعَلُ الحَزنَ إذا شِئتَ سَهلاً﴾.

﴿ئەڵڵاهوممە لا سەهلە ئیللا ما جەعەلتەهو سەهلەن وەئەنتە تەجعەلولحەزنە ئیذا شیئتە سەهلەن﴾.

واتە: خودایە هیچ کارێک ئاسان نییە مەگەر ئەوەی تۆ ئاسانت کردووە و ئەگەر تۆ ویستت لێبێت زبری و ناخۆشی و گرانی ئاسان دەکەیت.



# ئەگەر كارێک
# یان شتێک ڕوویدا و بە دڵی تۆ نەبوو

**ئەگەر كارێک یان شتێک ڕوویدا و بە دڵی تۆ نەبوو دەڵێین:**

﴿الحَمدُلله عَلی کُلِّ حالٍ﴾.

﴿ئەلحەمدولیللاهی عەلا كوللی حال﴾.

**واتە:** سوپاس بۆ خوای گەورە لەسەر هەموو حاڵ و بارێک.



**※ ئاگادار بن كە باپیرانمان وتویانە:**

تووڕەبوون باوكی هەموو تاوانەكانەو پەشیمانی بەدواوەیەو، ئارامگرتن دایكی هەموو خۆشییەكانە و ژیانێكی بێ هەڵە بەرهەم دەهێنێت.

# لە کاتی پژمیندا

سوننەتە ئەو کەسەی دەپژمێت بڵێت:

﴿أَلْحَمْدُلله﴾. ﴿ئەلحەمدولیللاهـ﴾.

**واتە:** سوپاس و ستاییش بۆ خودا.



## ئەگەر کەسێک لە لاتدا پژمی پێی بڵێیت:

﴿يَرحَمُكَ الله﴾. ﴿یەڕحەموکەڵڵاهـ﴾.

**واتە:** خودا ڕەحمت پێبکات.

ئەگەر پژمیت و کەسێک پێی وتیت:﴿يَرحَمُكَ الله﴾سوننەتە وەڵامی بدەیتەوە و پێی بڵێی:

﴿يَهدِيكمُ اللهُ وَيُصلِحُ بالَكُم﴾.

﴿یەهدیکومولڵاهو وەیوصلیحو بالەکوم﴾.

**واتە:** خودا ڕێنمایی ڕێی حەقتان بکات و هەموو کاروبارێکتان بۆ بسازێنێت.



* وا باشە کلێنسێک، یان دەستت بخەرە سەر دەمت و تاکو دەتوانیت دەنگت نزم بکەرەوە.

# له كاتی سه‌ردانیكردنی نه‌خۆشدا

**له كاتی سه‌ردانیكردنی نه‌خۆشدا سوننه‌ته بڵێین:**

﴿أَسأَلُ اللهَ العَظيمَ رَبَّ العَرشَ العَظيمِ أَن يَشفِيَكَ﴾

﴿ئه‌سئه‌لو ڵڵاهه‌لعه‌ظیم ڕه‌ببه‌لعه‌ڕشه‌لعه‌ظیم ئه‌ن یه‌شفییه‌كه﴾.

**واتــه:** داوا ده‌كــه‌م له خــوای مه‌زنی پــه‌روه‌ردگاری عه‌رشــی مه‌زن كه شــیفات بدات.



# له کاتی بوونی ئازاردا

ئەگەر کەسێک ئازارێک لە جەستەیدا هەبوو، یان نەخۆش بوو سوننەتە بڵێت:

﴿بِسمِ اللّٰه، بِسمِ اللّٰه، بِسمِ اللّٰه، أَعوذُ بِاللّٰهِ وَقُدرَتِهِ مِن شَرِّ ما أَجِدُ وَأُحاذِرُ (٦ جار)﴾.

﴿بیسمی للاهـ بیسمی للاهـ بیسمی للاهـ ئەعوذو بیللاهی وە قودرەتیهی مین شەرری ما ئەجیدو وەئوحانیر﴾.

واتە: بە ناوی خودا، بە ناوی خودا، بە ناوی خودا، پەنا دەگرم بە خوای گەورە و دەسەڵات و توانای لە خراپەی ئەو ئازارەی هەستی پێدەکەم و سڵی لێ دەکەمەوە.



# لە کاتی باران باریندا

لە کاتی باران باریندا سوننەتە بڵێین:

﴿أَللَّهُمَّ صَيِّباً نافِعاً﴾. ﴿ئەڵڵاهوممە صەییبەن نافیعەن﴾.

واتە: خودایە بارانێکی زۆری بەلێزمەی بەسوود بێت.



# دوای بارانبارین

دوای بارانبارین سوننەتە بڵێین:

﴿مُطِرنا بِفَضلِ اللهِ وَرَحمَتِهِ﴾.

﴿موطیرنا بیفەضلی للاهی وە ڕەحمەتیهی﴾.

واتە: بارانمان بۆ باری بە فەزڵ و سۆز و ڕەحمەتی خوای گەورەوە.

## لە کاتی تەماشاکردنی مانگ

لە کاتی تەماشاکردنی مانگ سوننەتە بڵێین:

﴿أَعوذُ بِاللهِ مِن شَرِّ هذا الغاسِقِ إذا وَقَبَ﴾.

﴿ئەعونو بیللاهی مین شەرری هاناالغاسیقی ئیذا وەقەب﴾.

واتە: پەنا دەگرم بە خودای گەورە لە خراپەی ئەم تاریکییەی شەو کە دادێت.

---

## کاتی بیستنی هەورە تریشقە، هەورە بروسکە

لە کاتی بیستنی هەورە تریشقەدا سوننەتە بڵێین:

﴿سُبحانَ الَّذي يُسَبِّحُ الرَّعدُ بِحَمدِهِ وَالمَلائِكَةُ مِن خِيفَتِهِ﴾.

﴿سوبحانەللەذی یوسەببیحو ڕڕەعدو بیحەمدیهی
وەلمەلائیکەتو مین خیفەتیهی﴾.

واتە: پاک و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە هەورەگرمەش سوپاس و ستاییشی ئەو ﴿خوا﴾ دەکات، هەروەها فریشتەکانیش لە هەیبەت و ترسی ئەو ﴿خودا﴾ ستاییشی دەکەن.

---

## لە کاتی هەڵکردنی با

لە کاتی هەڵکردنی با سوننەتە بڵێین:

﴿أَللّهُمَّ إِنّي أَسأَلُكَ خَيرَها وَأَعوذُ بِكَ مِن شَرِّها﴾.

﴿ئەڵلاهوممە ئیننی ئەسئەلوکە خەیرەها وە ئەعونو بیکە مین شەرریها﴾.

واتە: خودایە داوای چاکی و خێرەکەیت لێدەکەم و پەنات پێدەگرم لە خراپەکەی.

# له كاتی سواربوونی ئۆتۆمبێلدا

**له كاتی سواربوونی ئۆتۆمبێلدا سوننه‌ته بڵێین:**

﴿بِسمِ اللهِ، أَلحَمدُلِلهِ سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ﴾.

﴿بیسمی للاهـ، ئه‌لحه‌مدولیللاهـ سوبحانه‌لله‌ذی سه‌خخه‌ڕه له‌نا هاذا وه‌ماكوننا له‌هو موقرینین﴾.

**واته:** به ناوی خودا، هه‌موو سوپاس و ستایش بۆ خودا، پاك و بێگه‌ردی بۆ ئه‌و (خودایه)ی كه ئه‌مه‌ی بۆ ڕامهێناوین، كه ئێمه توانامان به سه‌ریدا نه‌بوو، وه به ڕاستی ئێمه بۆ لای په‌روه‌ردگارمان ده‌گه‌ڕێینه‌وه.



* له كاتی شۆفێری كردندا منداڵی ژێر پرسیاری له دایك و باوكی یان كاكی شۆفێر ناكات هه‌تا بۆ ئه‌وه‌ی سه‌رقاڵیان نه‌كات و هیچ شتێكی ناخۆش ڕوونه‌دات.

# کاتی بەڕۆژووبوون




- سوننەتە پارشێو بکەین چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە.

- خۆمان بگرینەوە لە هەموو جۆرە قسە و گوفتارێکی نەشیاو و نەگونجاو، پاشان ئەگەر کەسێکیش قسەی ناشیرین یان شەڕی پێفرۆشتیت ئەوا بڵێ: من بەڕۆژووم، من بەڕۆژووم، واتە: بە هەموو شێوەیەک خۆت لا بدە لە شەڕکردن.

# لە کاتی بەربانگکردنەوە و ڕۆژوو شکاندندا

**لە کاتی بەربانگکردنەوە ورۆژوو شکاندندا سوننەتە بڵێین:**

﴿ذَهَبَ الظَّمأُ وَابتَلَّتِ العُروقُ، وَثَبَتَ الأَجرُ إن شاءَ اللهُ﴾.

﴿ذەهەبەظظەمئو وەبتەللەتیلعوڕوق، وەثەبەتەلئەجرو ئینشائە ڵڵاهـ﴾.

**واتە**: تینوویەتی ڕۆیشت و دەمارەکان تێرئاو بوون و تەڕبوونەوە و پاداشتەکەشمان چەسپاوە و مسۆگەرە ئەگەر خوای گەورە ویستی لێبێت .

* **کارێکی جوانە لە کاتی ڕۆژوو شکاندندا بە کوردی بڵێن: ﴿خودایە بۆ تۆ بەڕۆژووبووم و بە نیعمەتی تۆ دەیشکێنم﴾.**

# ئەگەر کەسێک یارمەتیدایت و چاکەیەکی لەگەڵدا کردیت

**ئەگەر کەسێک یارمەتیدایت و چاکەیەکی لەگەڵدا کردیت ئێمەش سوپاسی ئەو کەسە بکەین و سوننەتە پێی بڵێین:**

﴿جَزاكَ اللّٰه﴾. ﴿جەزاکەڵڵاهـ﴾.

**واتە:** خوای گەورە پاداشتت بداتەوە.

* ئێمەش هەوڵ بدەین ئەو چاکەیەی ئەومان لەبەرچاودا بێت و لە کاتی تردا چاکەی لەگەڵدا بکەینەوە ئەگەر پێویستی بە یارمەتی بوو، هەروەها بە بەردەوامی و هەرکاتێک بۆمان گونجا یارمەتی کەسانی تریش بدەین.

* هەمیشە ئەوەتان لە بیربێت کە خودای گەورە چاکەی چاکەکاران وننا‌کات، بۆیە یەکێک لە ڕەوشتە جوانەکانی منداڵی مسوڵمان، چاکە کردنە.

* پێغەمبەری ئازیزمانﷺ ئامۆژگاریمان دەکات کە ئەگەر بە دەستی ڕاست شتێکمان بەخشی بە کەسێک نابێت دەستی چەپمان بیزانێت، بۆیە هاوکاری هەر کەسێکتان کرد پێی مەڵێنەوە من یارمەتی تۆم داوە و هەروەها لای کەسی تریش باسی مەکەن.

* هەرگیز لەکاتی هاوکاری کردنی کەسێکدا داوای قەرەبوو مەکەن، یان هیچ پاداشتێک وەرمەگرن، بڵێن تەنها لەبەر خودای گەورە ئەم کارەمان کردووە.

## زیکری بەیانییان

سوننەتە لە بەیانییاندا بڵێین:

﴿أَللّهُمَّ بِكَ أَصبَحنا وَبِكَ أَمسَينا وَبِكَ نَحيا وَبِكَ نَموتُ وَإِلَيكَ النُّشُور﴾.

﴿ئەڵڵاهوممە بیکە ئەصبەحنا وەبیکە ئەمسەینا وەبیکە نەحیا وەبیکە نەموتو وەئیلەیکەننوشور﴾.

واتــە: خوداوەنــدا! بــە پشــتیوانی تــۆ وا ڕۆژمــان کــردەوە و هــەر بــە پشــتیوانی تۆیــش شــەو دەکەینــەوە و لە ســایەی تــۆوە دەژیــن و بە فەرمانــی تۆ دەمرین و کاتێکیــش زیندوودەبینــەوە دەگەڕێینەوە بۆ لای تۆ .

## زیکری ئێواران

سوننەتە لە ئێواراندا بڵێین:

﴿أَللّهُمَّ بِكَ أَمسَينا وَبِكَ أَصبَحنا وَبِكَ نَحيا وَبِكَ نَموتُ وَإِلَيكَ النُّشُور﴾.

(ئەڵڵاهوممە بیکە ئەمسەینا وەبیکە ئەصبەحنا وەبیکە نەحیا وەبیکە نەموتو وەئیلەیکەننوشور﴾.

واتە: خوداوەندا! بە پشــتیوانی تۆ وا شەومان کردەوە و هەر بە پشتیوانی تۆیــش ڕۆژ دەکەینــەوە و لــە ســایەی تــۆوە دەژیــن و بــە فەرمانی تۆ دەمریــن و کاتێکیــش زیندوودەبینەوە دەگەڕێینــەوە بۆ لای تۆ.

## نزا و دوعای (سید الإستغفار)

یەکێکــە لــە زیکرەکان لە بەیانییان و ئێوارانــدا دەخوێندرێت و خێرێکی زۆر گەورەی هەیە.

﴿أَللَّهُمَّ أَنتَ رَبِّى لآ إلهَ الاَّ أَنتَ خَلَقتَنى وَأَنا عَبدُكَ وَأَنا عَلى عَهدِكَ وَوَعدِكَ ما استَطَعتُ، أَعوذُبِكَ مِن شَرِّ ماصَنَعتُ، أَبوءُ لَكَ بِنِعمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبوءُ بِذَنبى فَاغفِرلى فَإِنَّهُ لايَغفِرُ الذُنوبَ إلاَّ أَنتَ﴾.

﴿ئەڵڵاهوممە ئەنتە ڕەببی لائیلاهە ئیللا ئەنتە خەلەقتەنی، وەئەنا عەبدوکە وەئەنا عەلا عەهدیکە وەوەعدیکە مەستەطەعتو، ئەعوذو بیکە مین شەرری ماصەنەعتو، ئەبوئو لەکە بینیعمەتیکە عەلەییە وە ئەبوئو بیذەنبی فەغفیرلی فەئیننەهو لایەغفیرونذنوبە ئیللا ئەنت﴾.

**واتــە**: خودایە تۆ پەروەردگارمی و هیچ پەرســتراوێک نییە بە حەق جگــە لە تۆ، تۆ دروســتت کــردوم و من بەندەی تۆم و من لەســەر ئــەو پەیمــان و بەڵێنــەم کە بە تــۆم داوە تا بتوانم، پەنــات پێدەگرم لــە خراپــەی ئەوەی ئەنجامــم داوە لە گونــاه و تــاوان، ددان دەنێم بــە نیعمەتەکانتــدا لەســەرم و ددان دەنێم بە گونــاه و تاوانەکانمدا، ســا خوایە لێم خۆشــبە، چونکە بەڕاســتی کەس لە گوناه و تاوان خــۆش نابێت جگــە لە تۆ.

# سوجدەی تیلاوە
# لە کاتی خوێندنی قورئاندا

لــە قورئانی پیرۆزدا ﴿١٥﴾ شــوێن هەیە کە ﴿سُجودالتِّلاوة﴾ی پێدەوترێت کە هێمایەکــی هاوشــێوەی ئــەم هێمایــەی هەیە ﴿۩﴾ هــەر کاتێک گەیشــتینە ئەم هێمایە؛ ئەوا ســوننەتە ســوجدەیەک ببەین و ئــەم دوعایە بخوێنین:

﴿سَجَدَ وَجهىَ للَّذي خَلَقَهُ، وَشَقَّ سَمعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَولِهِ وَ قُوَّتِهِ فَتَبارَكَ اللهُ أَحسَنُ الخالِقين﴾.

﴿سەجەدە وەجهییە لیللەذی خەلەقەهو وەشەققە سەمعەهو وەبەصەڕەهو، بیحەولیهی وەقووەتیهی، فەتەباڕەکەڵڵاهو ئەحسەنولخالیقین﴾.

واتــە: ڕوخســارم ســوجدەی برد بۆ ئــەو خوایەی بە دەســتەڵات و ئیرادەی خۆی بەدییهێناوە و ئەندامی بیســتن و بینینی پێبەخشــیوم، پاکــی و بێگــەردی و بــێ کــەم و کورتی بــۆ ئــەو ﴿الله﴾ یەی کە هەر ئــەو بەدیهێنەرە.

# سوودەکانی زیکر و یادکردنی خودای گەورە

- خودای گەورە ئەو کەسانەی خۆشدەوێت کە زۆر زیکری دەکەن و زۆر باسی خودای گەورە دەکەن، خودای گەورەش بە هۆی ئەوەوە پاداشتی زۆریان دەداتەوە.

- زیکری خوای گەورە بریتییە لە خۆراکی ڕۆح و گیان و بەهۆی ئەو زیکرانەوە هەست بە دڵخۆشی و دڵئارامی دەکەین.

- لەبەر ئەوەی زیکری خوای گەورە دەبێتە قەڵایەک بۆمان، کە لە هەموو خراپەیەک دەمانپارێزێت.



# زیکرکردنی خودای گەورە

**ئەمەش هەندێک لە زیکرەکان کە بە وتنیان خێرێکی زۆرمان دەستدەکەوێت:**

١.﴿سُبحانَ اللهِ﴾ سوبحانەڵڵاهـ.

٢. ﴿ألحَمدُللهِ﴾ ئەلحەمدولیللاهـ.

٣. ﴿لا إلهَ إلاَّ الله﴾ لا ئیلاهە ئیللەڵڵاهـ.

٤. ﴿اللهُ أكبَر﴾ ئەڵڵاهو ئەکبەر.

٥.﴿أستَغفِرُالله﴾ ئەستەغفیروڵڵاهـ.

**یەکێکە لەو زیکرانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر دووبارەی کردووەتەوە.**

٦.﴿سُبحانَ اللهِ وَبِحَمدِهِ، سُبحانَ اللهِ العَظيم﴾.

﴿سوبحانەڵڵاهی وەبیحەمدیهی، سوبحانەڵڵاهیلعەظیم﴾.

**پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێت:** دوو وشە هەیە کە لەسەر زمان ئاسانن و لە تەرازووی چاکەکاندا قورسن و لە لای خوای گەورە خۆشەویستن ئەوانیش:

﴿سُبحانَ اللهِ وَبِحَمدِهِ، سُبحانَ اللهِ العَظيم﴾.

٧.﴿لا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلاّ بِالله﴾.

﴿لاحەولە وەلا قووەتە ئیللا بیللاهـ﴾.

پێغەمبەرمان ﷺ لە فەرموودەیەکدا باسی ئەوە دەکات کە ئەم زیکرە خەزێنەیەکە لە خەزێنەکانی قیامەت.

٨. ﴿سُبحانَ اللهِ والحَمدُ للهِ ولا إلهَ إلاَّ اللهُ واللهُ أكبَر﴾.

﴿سوبحانەڵڵاهی وەلحەمدولیللاهی وەلائیلاهەئیللەڵڵاهو وەڵڵاهو ئەکبەر﴾.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لە فەرموودەیەکیدا باسی ئەوە دەکات کە بە وتنی ئەم زیکرە دارخورمایەکت لە بەهەشتدا بۆ دەڕوێنرێت.

٩. **صڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ.**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەر کەسێک یەک صەلاواتم لەسەر بدات خودای گەورە بە هۆیەوە دە صەلاوات لەسەر ئەو کەسە دەدات.

﴿اللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِ سَيدِنا مُحَمَّدٍ﴾.

﴿ئەڵڵاهوممە صەللی عەلا سەییدینا موحەممەدین وەعەلا ئالی سەییدینا موحەممەد﴾.

10. ﴿لا إلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ وَهوَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَدير﴾.

﴿لا ئیلاهە ئیللەڵڵاهو وەحدەهو لاشەریکە لەهو لەهولمولکو وەلەهولحەمدو وەهووە عەلا کوللی شەیئین قەدیر﴾.

# بەشی سێهەم

## مانا و تەفسیری ناوەکانی خودای گەورە

## نەوەد و نۆ ناو لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

سُورَةُ الأَعۡرَافِ

﴿١٧٩﴾ وَلِلَّهِ
ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ
سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٨٠﴾

**واتە:** جوانترین ناوەکان هی خودان، بەو ناوە جوانانە لێی بپاڕێنەوە، واز لەو ناوانە بێنن کە گومڕاکان بە بێ دەلیل لە خودایان دەنێن، ئەوانە لە دواڕۆژدا تۆڵەی کردەوەی خۆیانیان لێدەکرێتەوە.

**پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لە فەرموودەیەکدا باسی ئەوە دەکات کە:**

خوای گەورە نەوەد و نۆ ناوی هەیە لە سەد یەکی کەمە، هەر کەسێک بیژمێرێت و ماناکەی بزانێت و بڕوای پێ هەبێت و تا دەتوانێت خۆی بە ماناکەی بڕازێنێتەوە دەچێتە بەهەشتەوە.

١.﴿اللّٰه﴾ئەڵڵاهـ: ئەم ناوە ناوی مەزنی خوای گەورەیە و هەموو ناوە پیرۆزەکانی لەم ناوەدا کۆکراوەتەوە.

٢. ﴿الرَّحمن﴾ئەڕڕەحمان: بە بەزەیی، بەزەییەکەی هەموو شتێکی گرتووەتەوە.

٣. ﴿الرَّحيم﴾ئەڕڕەحیم: بەخشندە، تایبەت بە ئیمانداران لە ڕۆژی دواییدا.

٤. ﴿المَلِك﴾ئەلمەلیک: پادشا و خاوەن موڵکی تەواو و دەستڕۆیشتوو لە موڵکەکەیدا.

٥. ﴿المَلِيك﴾ئەلمەلییک: موڵک بەدەستی دروستکراوەکان.

٦. ﴿القُدُّوس﴾ئەلقوددوس: پیرۆز و پاک و بێگەرد لە هەموو عەیب و ناتەواوییەک.

٧. ﴿السَّلام﴾ئەسسەلام: بێ عەیب و بڵاوکەرەوەی ئاشتی.

٨.﴿المُؤمِن﴾ئەلموئمین: دڵنیاکاری دۆستەکانی لە سزا، بەڕاستدانەری بەڵێنەکەی بۆ بەندەکانی.

٩. ﴿المُهَيمِن﴾ئەلموهەیمین: زاڵ و بینەر و چاودێر، بینەرە بەسەر بەندەکانیەوە و ئاگای لە بارودۆخی هەموانە.

١٠.﴿العَزيز﴾ئەلعەزیز: زاڵ و دەستەڵاتدار.

١١. ﴿الجَبَّار﴾ ئەلجەبباڕ: بەدەستەڵاتی ناچارکەر.

١٢. ﴿المُتَكَبِّر﴾ ئەلموتەکەببیر: خۆبەگەورەزان.

١٣. ﴿الخَالِق﴾ ئەلخالیق: دروستکار لە نەبوونەوە.

١٤. ﴿الخَلاَّق﴾ ئەلخەللاق: بەدیهێنەری کاربەجێ.

١٥. ﴿البارِيء﴾ ئەلباریئ: بەدیهێنەری جوانکار.

١٦. ﴿المُصَوِّر﴾ ئەلموصەوویر: وێنەکێش، وێنەکێشەری هەموو دروستکراوان.

١٧. ﴿الغَفَّار﴾ ئەلغەففاڕ: لێخۆشبووی تەنیا و پۆشەری عەیبە.

١٨. ﴿القَهّار﴾ ئەلقەهھاڕ: بەتوانا و دەستەڵاتدار بەسەر هەموو شتێکدا.

١٩. ﴿القاهِر﴾ ئەلقاهیر: گەردن کەچکەر بە توانای خۆی.

٢٠. ﴿الوَهّاب﴾ ئەلوەهھاب: زۆر بەخشەر.

٢١. ﴿الرَّزّاق﴾ ئەڕڕەززاق: سەرچاوەی ڕۆزیدان.

٢٢. ﴿الرَّازق﴾ ئەڕڕازیق: ڕۆزیدەری هەموو زیندەوەران.

٢٣. ﴿الفَتَّاح﴾ئەلفەتتاح: دەرووکەرەوە و ئاسانکار.

٢٤. ﴿العَلِيم﴾ئەلعەلیم: زانا بە هەموو دروستکراوان و نهێنییەکانیان.

٢٥. ﴿القابِض﴾ئەلقابیض: ڕۆزی لێگرەوە.

٢٦. ﴿الباسِط﴾ئەلباسیط: ڕۆزی بۆ فراوانکەر.

٢٧. ﴿السَّمِيع﴾ئەسسەمیع: بیسەری بێسنوور بە هەموو شتێک.

٢٨. ﴿البَصِير﴾ئەلبەصیر: بینەری بێسنوور بە ئاشکرا و پەنهان.

٢٩. ﴿الحَكَم﴾ئەلحەکەم: فەرمانڕەوای دادوەر.

٣٠. ﴿اللَّطِيف﴾ئەللەطیف: نەرم و چاکەکار لەگەڵ دروستکراوانی.

٣١. ﴿الخَبِير﴾ئەلخەبیر: شارەزا بە وردەکاری شتەکان لەسەر حەقیقەتی خۆی.

٣٢. ﴿الحَكِيم﴾ ئەلحەکیم: کاربەجێی لێزان و بێ هەڵە لە کارەکانیدا.

٣٣. ﴿الحَلِيم﴾ ئەلحەلیم: هێدی، ئارام و پاشخەری سزا.

34. ﴿العَظِيم﴾ئەلعەظیم: مەزنایەتی و خاوەنی شکۆ.

٣٥. ﴿الغَفور﴾ ئەلغەفور: لێخۆشبوو و گوناهپۆش.

٣٦. ﴿الشَّكور﴾ ئەششەکور: سوپاسی چاکەی کەم دەکات و پاداشتی زۆری دەداتەوە.

٣٧. ﴿الشَّاكِر﴾ ئەششاکیر: سوپاسی کردەوەی کەم دەکات و وەریدەگرێت و لە گوناهی زۆریش خۆشدەبێت.

٣٨. ﴿الرَّبّ﴾ ئەڕڕەب: پەروەردگار.

٣٩. ﴿العَليّ﴾ ئەلعەلی: بەرزی بە دەسەڵات.

٤٠. ﴿الأَعلى﴾ ئەلئەعلا: بڵند، بڵندبووەتەوە لەسەر عەرشەکەی.

٤١. ﴿الكَبير﴾ ئەلکەبیر: گەورەی بێکۆتا لە گەورەییدا.

٤٢. ﴿الحَفيظ﴾ ئەلحەفیظ: پارێزەری هەموو گەردوون و بەندەکانێتی.

٤٣. ﴿المُقيت﴾ ئەلموقیت: بەخشەری ڕزق و ڕۆزی، دەستەڵاتدار.

٤٤. ﴿الحَسِيب﴾ ئەلحەسیب: لێپرسەرەوە و جێی ڕاز بۆ بەندەکان و بۆیان بەسە.

٤٥. ﴿الكَريم﴾ ئەلکەریم: بەڕێز، ڕێزگر.

٤٦. ﴿الأَكرَم﴾ئەلئەكرەم: ڕێزگری دۆست و هەڵبژێردراوەكانیەتی و بەخشەرە بە بێ بەرامبەر.

٤٧. ﴿الرَّقيب﴾ئەڕڕەقیب: چاودێر بە بەندەكانی.

٤٨. ﴿القَريب﴾ئەلقەریب: نزیک ﴿نزیکە بەتوانای و بە زانستیشی﴾.

٤٩. ﴿المُجيب﴾ئەلموجیب: وەڵامگۆ، وەڵامی پاڕانەوە دەداتەوە.

٥٠. ﴿الواسِع﴾ئەلواسیع: فراوان، ڕۆزیدان و بەزەییەكەی هەموو شتێكی گرتووەتەوە.

٥١. ﴿الوَدود﴾ ئەلوەدود: خۆشویستراو لە دڵی دۆستەكانیدا.

٥٢. ﴿المَجيد﴾ ئەلمەجید: پایەبەرزی تەواو ڕێزدار و چاكەكار.

٥٣. ﴿الشَّهيد﴾ ئەششەهید: ئاگادار، هیچی لێ وننابێت.

٥٤. ﴿الحَقّ﴾ ئەلحەق: پایەدار و ڕاست و ڕەوا، حەق.

٥٥. ﴿الوَكيل﴾ ئەلوەكیل: كار پێسپێردراو، پشت و پەنا.

٥٦. ﴿القَوِيّ﴾ئەلقەوی: بەتوانا بەسەر هەموو توانایەكدا.

٥٧. ﴿المَتين﴾ئەلمەتین: بەهێزی بێ نیاز بە هاوتا و بێ كۆتا.

٥٨. ﴿الوَلِي﴾ئەلوەلی: دۆست، سەرخەر و یاریدەدەری گوێڕایەڵیکارانی.

٥٩. ﴿المَولی﴾ئەلمەولا: پشت و پەنا و سەرپەرشتیکاری ئیمانداران.

٦٠. ﴿الكافي﴾ئەلکافی: بەس، بۆ بەندەکانی بەسە ئەگەر بیکەنە پشت و پەنا.

٦١.﴿الحَميد﴾ئەلحەمید: سوپاسکراو و کاربەجێ لە کاروکرداریدا.

٦٢. ﴿المُعطي﴾ئەلموعطی: بەخشەر.

٦٣. ﴿المُحيط﴾ ئەلموحیط: دەوری هەموو شتێکی داوە بە زانست و توانا و بەزەیی خۆی.

٦٤.﴿الحَيّ﴾ئەلحەی: زیندووی بێ سەرەتا و کۆتایی (ئەزەلی).

٦٥. ﴿القَيُّوم﴾ئەلقەییوم: هەڵسووڕێنەری کار و کردار و بێ ئیحتاج بە کەس.

٦٦. ﴿الواحِد﴾ئەلواحید: یەک و تەنیایە.

٦٧. ﴿الأَحَد﴾ ئەلئەحەد: تاک و تەنیایە لە زات و سیفاتیدا.

٦٨. ﴿السَيِّد﴾ئەسسەید: سەروەر و گەورە و خاوەنی سەروەری ڕەها.

٦٩. ﴿الصَّمَد﴾ئەصصەمەد: جێی مەبەست و جێی نیازە و پێویستیشی بە کەس نییە.

٧٠. ﴿القَدير﴾ئەلقەدیر: بەتوانای بێسنوور.

٧١. ﴿القادِر﴾ئەلقادیر: تواناداری بێ کۆتا و بێ سەرەتا.

٧٢. ﴿المُقتَدِر﴾ئەلموقتەدیر: خاوەن سەرچاوەی توانایە و بەتوانای تەواوە.

٧٣. ﴿المُقَدِّم﴾ئەلموقەددیم: پێشخەری دانەر لە شوێنی خۆیدا.

٧٤. ﴿المُؤَخِّر﴾ ئەلموئەخخیر: دواخەری دانەر.

٧٥. ﴿الأَوَّل﴾ئەلئەووەل: یەکەمین، واتە خوای گەورە پێش هەموو شتێک هەبووە.

٧٦. ﴿الآخِر﴾ئەلئاخیر: دوایەمین، واتە خوای گەورە پاش هەموو شتێک دەمێنێت.

٧٧. ﴿الظاهِر﴾ئەظظاهیر، دیار و ئاشکرایە.

٧٨. ﴿الباطِن﴾ئەلباطین: پەنهان و شاراوەیە.

٧٩. ﴿المُتَعال﴾ ئەلموتەعال: زۆر بەرز، خۆ بەرزگر لەسەر عەرش.

٨٠. ﴿البَرّ﴾ ئەلبەڕ: چاکەکاری بە بەزەیی لەگەڵ دروستکراوەکانیدا.

٨١. ﴿التَّوّاب﴾ ئەتتەوواب: تەوبە وەرگر و لێخۆشبوو.

٨٢. ﴿العَفوّ﴾ ئەلعەفوو: لێبووردە لە گوناه.

٨٣. ﴿الرَّؤوف﴾ ئەڕڕەئوف: زۆر میهرەبان بەرامبەر بە گوناهباران.

٨٤. ﴿الجَميل﴾ ئەلجەمیل: جوانی بێسنوور لە زات و سیفاتدا.

٨٥. ﴿الرَّفيق﴾ ئەڕڕەفیق: نەرم و لەسەرخۆ و پێویستی ئاسان دەکات کە بەبێ ئەو نایەتەجێ.

٨٦. ﴿الحَيي﴾ ئەلحەیی: بەشەرم، بەجۆرێک هاوتای نییە و لە هیچ شتێک ناچێت.

٨٧. ﴿السَّتير﴾ ئەسسەتیر: داپۆشەری عەیب و گوناه.

٨٨. ﴿الإله﴾ ئەلئیلاه: پەرستراوی حەق.

٨٩. ﴿المُبين﴾ ئەلموبین: ڕۆشنکەرەوە.

- پایەکانی ئاینیی ئیسلام
- بانگ
- دەستنوێژ
- فێربوونی نوێژ هەنگاو بە هەنگاو
- سونەتەکانی پێغەمبەری ئازیزمان
- مانا و لێکدانەوەی ناوە پیرۆزەکانی خودای گەورە




لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

bookadiban@gmail.com _adiban @eadiban

07731974646 07501696369 07501590032